تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
پەند و
مەتەڵ و
قسەی پێشینیان
دیاری تیلەکۆ
خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی
پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان
لەروانگەی کۆمەڵناسییەوە
نووسین و کۆکردنەوەی
خالید عەلیزادە

# دیاری تیلەکۆ

## پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان

(خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی پەند و مەتەڵ
و قسەی پێشینیان لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە)

نووسین و کۆکردنەوەی:

خالید عەلیزادە

گوتار ١٣٩١

علی‌زاده، خالد، ۱۳۵٤، گردآورنده
دیاری تیله‌کۆ
پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان ...
سقز: گوتار، ۱۳۹۰
ISBN: ۹۷۸-٦۰۰-٥٦٤۷-۳۰-۳
موضوع: ضرب‌المثل‌های کُردی
فهرست‌نویسی بر اساس اطلاعات فیپا
۱۳۹۰ ۷۷ع۲۵آ/ ۳۲٥٦ PIR ۳۹۸/۹۹۱٥۹۷
کتابخانەی ملی ایران: ۲٦۲۷٥۹۳


پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان

**دیاری تیله‌کۆ**

نووسین و کۆکردنەوە: خالید عەلیزادە

دیزاینی بەرگ و ناوەرۆک: ئازاد سورخی

پیتچن: ئومید موقەددەس

چاپی یەکەم: ۱۳۹۱

ئەژمار: ۲۰۰۰

نرخ: ٥۰۰۰ تمەن

ناوەندی چاپ و بلاوکردنەوەی گوتار

کوردستان، سەقز، شەقامی سەلاحەدین ئەیووبی

تەلەفوون: ۳۲۲۷۰۳۰ _ ۰۸۷٤

Email: khaled_alizadeh@yahoo.com

**پێشکەش:**

بەو قوتابییە خۆشەویستانەی

کە لە کۆکردنەوەی

ئەم پەند و مەتەڵانەدا

بەشدارییان هەبووە.

# خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی پەندومەتەڵ و قسەی پێشینیان لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە

## سەرەتا

پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان و بەگشتی ئەدەبی فۆلکلۆر، یەکێك لە بنەما و کۆڵەکە سەرەکیەکانی پێکهێنەری کلتووری هەر میللەتێکن کە دانیشتووان و خەڵکانی ئەو میللەتە بە درێژایی مێژوو لە ڕوو بە ڕوو بوونەوە لەگەڵ ژیان، بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانیان و بە گشتی بۆ مانا بەخشین بە ژیان لە ڕێگەی ئەزموون و هەڵەکردن و ڕاست کردنەوەی هەڵەکانیانەوە دایان هێناوە و ئەمڕۆ وەکوو میراتێکی گرنگ بۆ ئێمە بەجێ ماوە.

میللەتی کوردیش وەکوو یەکێك لەو میللەتانەی سەر گۆی زەوی، بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیای خاکەکەی لە ناوچەی مێزۆپۆتامیا، کە بە وتەی هەندێك لە مێژوونووسان یەکێك لە کۆنترین مەڵبەند و ناوچەکانی جیهانە کە سەردەمانێك ئاخێزگەی سەرهەڵدانی شارستانیەتی مرۆڤ بووە و خاوەنی میراتێکی دەوڵەمەندی کولتوورییە. هەربۆیە ئاوڕدانەوە لەم گەنجینە پڕ بایەخ و دەوڵەمەندە لە پلەی یەکەمدا دەتوانێ ببێتەهۆی دەوڵەمەندترکردنی کلتووری جیهانی و لە ئاستی دواتردا کلتووری میللەتی کورد.

پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان لە رووی دابەشکردنی بابەتییەوە، دەچێتە خانەی ئەدەبیاتی فۆلکلۆر (Folklore Literature) یان بە وتەی هەندێك لە شارەزایانی ئەم بوارە دەچێتە خانەی ئەدەبی زارەکییەوە (Oral Literature). هەروەها ئەدەبیاتی فۆلکلۆر بۆ خۆی دەکەوێتە خانەیەکی گەورەترەوە بە ناوی کولتوور (Culture).

لەمەڕ ئەدەبیاتی فۆلکلۆر بەگشتی لەلایەن کەسانێکەوە کە لەم بوارەدا لێکۆڵینەوە و پشکنینیان کردووە، قسەی زۆر گوتراوە و نووسراوە کە نامەوێ بە جۆرێك هەموو ئەو قسانە دوو پات بکەمەوە، بەڵام شتێك کە پێویستە باس بکرێ، ئەوەیە کە زۆربەی ئەو کەسانەی کە لەم بوارەدا کاریان کردوە لەسەر گرنگی و بایەخی فەرهەنگی فۆلکلۆر کۆکن. (ئەحمەدی: ١٣٨٩، پارسا: ١٣٨٧، کریستیەن: ١٣٨٤). لە هەمانکاتدا نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە گرنگی و بایەخی فەرهەنگی

فۆلکلۆر بە مانای ئەوە نییە کە هەموو هێمان و ئێلمێنتەکانی پێکهێنەری ئەرێنی و باشن، بەڵام دەمەوێ بڵێم ئەگەر فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی بۆ هەموو گەلانی جیهان گرنگە و بەنرخە، ئەوا بۆ گەلی کورد و گەلانی وەکوو ئێمە کە لەم دونیایەدا بەهۆی جیاوازەوە، نەمان توانیوە بە زمانی خۆمان بخوێنین و لەوەش گرنگتر نووسینمان بە زمانی کوردی زۆر کەم و ئەوەشمان هەبووە بە هۆکاری جۆربەجۆر لە نێو چووە و ئێستا ئەو نووسراوانەی کە بۆمان ماوەتەوە لەگەڵ ئەو شتەی کە لە سەرەتادا لەسەر هەڵکەوتەی جوگرافیای مێژووی کورد وەکوو میللەتێکی دێرین باسمان کرد، یەک ناگرێتەوە و ئێجگار کەمە. هەر بۆیە شاعیری خەمخۆر و بەپەرۆشی کورد، حاجی قادری کۆیی، کورد وەکوو میللەتی بێ کتێب ناو دەبات، بابەتێك کە ئەمڕۆ وەکوو پێناسە و شوناسی زمان و خاك و فەرهەنگی نەتەوە باسی لێدەکەن. لێرەدایە کە گرنگی فۆلکلۆر بۆ ئێمە زیاتر لە هەموو میللەتانی دیکە دەردەکەوێ و لە وەها هەلومەرجێکدا ئەرکی خوێندەوارانی کورد زیاتر دەبێ و دەبێ سەرەتا هەوڵ بدرێ بە خێرایی و چاوکراوەیی هەرچی زیاتر ئەم گەنجینە پڕبایەخە کۆبکرێتەوە، چونکە لەنێوچوونی هیچ کاتێك بۆ ئێمە قەرەبوو نابێتەوە و دواتر هەر کەسێك بە پێی توانا و بواری پسپۆڕی خۆی دەتوانێ ئەم بابەتانە لێکبداتەوە و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکا و بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە بیانخاتە بەرباس و شرۆڤەکردن و بە خوێندنەوەییەکی نوێتر لە فۆلکلۆر، لایەنە خراپەکانی وەلا بنرێ و لایەنە باشەکانی بەهێزتر بکرێن، تاکوو لەم ڕێگەوە ببینە هۆی دەوڵەمەندکردن و نۆژەنکردنەوەی کولتوورەکەمان، بابەتێك کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەست بە شۆناس بکەین و ئەم هەست بە شۆناس کردنە دەتوانێ لەسەر هەموو تاکەکانی کومەڵ کاریگەری هەبێ و لە **قەیرانی شۆناس** (Identitiy Crisis) و بێگانەبوون لە کولتووری خۆمان (Alienation of culture) بمانپارێزێ، دیاردەییەك کە ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی کورد بەهۆی نەبوونیەوە خۆیان لە خەڵکانی دیکەی جیهان و بەتایبەت دراوسێکانیان بە کەمتر دەزانن و لە باتی ئەوەی داهێنەر بن و گرنگی بە کولتووری خۆیان بدەن، شەو و ڕۆژ بە دوای ئەوەوەن، بزانن چ شتێك لە دەرەوە دێت تا دووپات و چەند پاتی بکەنەوە. لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئەو گلەیی و گازندەیە لەهەندێ توێژی خوێنەواری کورد بکرێ کە دەتوانن ئەمڕۆ بە نووسین و لێکۆڵینەوە یارمەتی و خزمەتی میللەتی خۆیان بدەن، بەڵام هەر بەهۆی هەمان قەیرانی شۆناس کە باسی لێکرا، خەریکی خزمەت کردنی کلتووری کەسانێکی دیکەن کە بەلایانەوە گرنگ و پڕبایەخە، ئەمەش بۆ خۆی پەتا و درمێکە کە بەداخەوە زۆربەی خوێندەوارانی گرتووەتەوە.

بەداخەوە ئەمڕۆ خوێندەواری وا دەبینین کە شارەزاییەکی زۆریان لە بوارە جۆربەجۆرەکان و بە

تایبەت لە بواری زانستە مرۆییەکان و هەروەها لەسەر ئەندێشەی رۆژئاوا هەیە، بەڵام لەسەر کولتووری کوردی، کەسایەتییەکانی و تایبەتمەندیی کۆمەڵگای کوردی، هیچ جۆرە زانیارییەکی ئەوتۆیان نییە یان وەك دەڵێن لە گوێی گادا نووستون کە ئەم دیاردەش بۆ خۆی دەتوانێ چەندین هۆکاری هەبێت. بێجگە لە «قەیرانی شۆناس» کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا، هۆکارێکی گرنگتر ئەوەیە کە هەندێك لە خوێندەواران و نوخبەی کورد خۆخەریك کردن بە ئەدەبی کوردی بەگشتی و بە تایبەت فۆلکلۆر بە کارێکی دواکەوتوانە دەزانن. زاڵبوونی وەها بۆچوونێك بە سەر توێژی خوێندەواردا دەتوانێ ئاکامی خراپی لێ بکەوێتەوە. دەرئەنجامێکی ئەمجۆرە بیرکردنەوە ئەوەیە بە بێ ئەوەی کە هیچ جۆرە زانیارییەکیان لەسەر هەلومەرج و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای خۆیان هەبێت ئەو جۆرە بیروبۆچوونە رۆژئاواییانە بەسەر واقیعی کۆمەڵگا دەسەپێنن و ئەگەر واقیعی کۆمەڵگا لەگەڵ ئەو تیۆری و چەمکانە یەك نەگرێتەوە، ئەوا کۆمەڵگای کوردستان بە دواکەوتوو دەزانن، بێ ئەوەی کە هیچ جۆرە رەخنەیەك لەو جۆرە چەمك و تیۆریانە بگرن و ئەوەیان لە بیرکردووە کە هەر کۆمەڵگایەك بەهۆی تایبەتمەندی کات و شوێن لەگەڵ کۆمەڵگای دیکە جیاوازی هەیە، واتە ناسینی کۆمەڵگا بۆ هەر توێژەرێك پێش‌مەرجێکی سەرەکییە و ناسینی تیۆری وەکوو پێویستییەکی دواتر چاوی لێدەکرێ. بەچاو لێکردن لە مێژووی میللەتان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ئەو کەسانەی کە لەم جیهانەدا قسەیەکیان بۆ گوتن هەبووە و ئەمرۆ لە یادەوریدا ماونەتەوە، بەتەنیا ئەو کەسانەن کە لەسەر واقیعی کۆمەڵگای خۆیانەوە سەریان هەڵداوە نە بەلاسایی کردن و چاو لێکردن لە خەڵکانێکی دیکە.

نامەوێ زۆرتر لەمە لە باسەکە دوور بکەومەوە، حەز دەکەم لەسەر بایەخی فۆلکلۆر ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بدەم کە ئەمرۆ هەندێك پێیان وایە فۆلکلۆر بەگشتی رۆڵی DNA دەگێرێ لە ناسینەوەی کۆمەڵگا، بەسەرهات و مێژووی میللەتان کە بە هەر هۆکارێك مێژووی کۆمەڵایەتی، سیاسی، رامیاری، و فەرهەنگیان کەوتوەتە مەترسی لەنێوچوون، واتە دەکرێ بە پشت بەستن بە فولکلۆر مێژووی ئەو میللەتانە سەر لەنوێ درووست بکەنەوە و لە هەمانکاتدا لە میللەتانی دیکە جیا بکرێنەوە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان وەکوو بابەتی باسەکەی ئێمە، بەشێك لە کۆنترین ئەدەبیاتی مرۆڤە، واتە مرۆڤ پێش لەوەی کە شێعر بلێ و نووسین و خەت دابهێنێ، پەند و قسەی نەستەقی داهێناوە، بابەتێك کە ئەمرۆ بووەتە زاخاوی مێشکی قسەی خەڵکی لادێ و شاری، خوێنەوار و نەخوێنەوار، ژن و پیاو، منداڵ و گەورە و لە هەمانکاتدا بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی قسەکانی خۆمان و بە درۆ خستنەوەی لایەنی بەرانبەر تا ئەو جێگەی کە

پەند و قسەی پێشینیان وەکوو کتێبی مافی خەڵکی لادێ ناوی لێدەبەن کە لە ژێر زمانیاندایە و لە کاتی پێویستیدا کەڵکی لێوەردەگرن (پارسا، ١٣٨٧ : ٢٠٣). بەکورتی دەتوانین بڵێین فۆلکلۆر، گەنجینە و خەزێنەیەکی پڕ نرخ و بەهایە کە بە درێژای مێژوو، شوناسی میللەتانی لە مەترسی باو بۆران، هێرشی دز و جەردە و داگیرکەران پاراستووە. چونکە لە سینگی خەڵکدا نەوە بە نەوە هاتووە تا بە ئەمڕۆ گەیشتووە، بابەتێك کە بە پێچەوانە لە نووسراوە و کتێبدا نابینرێ (سەرچاوەی پێشوو: ٢٠٣).

بە گشتی ئەدەبی فۆلکلۆر ئەگەرچی داهێنەری تایبەت و ناسراوی نییە، بەڵام موڵکی هەموو خەڵکە. بابەتێك کە ئەمڕۆ لە کۆمەڵناسی مافدا، لەژێر ناوی **«مافی فۆلکلۆر»** ناوی لێدەبەن، واتە فۆلکلۆر مافی هەموو خەڵکە و دەبێ لەو مافە بە کۆمەڵە، پارێزگاری بکرێ و هەرجۆرە کەمتەرخەمییەك لەم بوارەدا دەتوانێ لەگەڵ خۆی، کۆمەڵێك دەرئەنجامی خراپ و نەرێنی بەدواوە بێت (سەرچاوەی پێشوو: ٦٦).

رابردووی ئەم باسە، واتە بایەخ و بەهادان بە مافی فۆلکلۆر لە دونیادا بە گشتی بۆ سەردەمی مۆدێرن لە ئەورووپا دەگەڕێتەوە. بە مانایەکی دیکە لە دوای گەشەسەندن و پێشکەوتنی مرۆڤ لە بواری تەکنۆلۆژیا و زاڵبوون بەسەر، سەرچاوە ئینسانی و سروشتییەکاندا تا رادەیەکی زۆر بووە هۆی مەترسییەکی گەورە بۆ لەناوچوونی فۆلکلۆر لای رۆژئاواییەکان و دواتر بەهۆی گەشەسەندنی سەرمایەداری و دەربازکردنی سنوورەکانی رۆژئاوا بەهۆی لۆژیکی ناوخۆیی سیستەمی سەرمایەداری، وەها ترس و نیگەرانییەك لەلای ولاتانی رۆژهەلاتی هاتەئاراوە. ئەم ترس و نیگەرانییە لە ناوەرۆکی فۆلکلۆرەوە سەرچاوە دەگرێ کە ناوەرۆکێکی غەیرە توجاری و بازرگانی هەیە و شتێکی لۆکاڵی و ناوچەییە کە دەتوانێ ببێتە لەمپەر و بەربەستێك لە بۆ کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلی سەرمایەدارەکان.

هەروەها کە باسمان کرد، پێش لە دەوڵەتانی رۆژهەلاتی، ولاتانی رۆژئاوا هەستیان بەم مەترسییە کرد. هەر بۆیە دەوڵەتانی ئەورووپایی بە پەلە کەوتنە هەوڵ بۆ کۆکردنەوە، پاراستن و پارێزگاری میرات و کەلەپووری فۆلکلۆری باو و باپیرانیان و لێرەدایە کە رۆڵی دەوڵەتی بەرپرس زۆرتر بەرچاو دەکەوێ و ئێمە بەهۆی لە پەراوێزکەوتن و نەبوونی خەمخۆر و کەسایەتی دڵسۆز، بەشێکی زۆرلە کەلەپووری فۆلکلۆریمان بە تالان چوون و بەشێکی دیکەی بەهوی ئەوەی کە تۆمار نەکراون روو لە ناوچوونن. بەڵام شتێك کە لێرەدا دەبێ باسی لێبکرێ ئەوەیە کە فرمێسك رشتن بۆ رابردوو نە تەنیا برینەکانمان سارێژ ناکا، بەڵکوو زۆخ و زامان سەرلەنوێ دەکولێنێتەوە. هەربۆیە لەم کات و ساتەدا

پێویستە هەوڵ بدرێ ئەو بەشەی فۆلکلۆر کە ماوە بە گورجی و خێرایی کۆ بکرێتەوە و هەر کەسە لە جێی خۆی و بەپێی توانای دەبێ لە هەموو شوێنێك و بە تایبەت لە لادێکان قوڵی لێهەڵماڵین و کۆیان بکەینەوە یان ئەوەی کە هەوڵ بدرێ بە شێوە ڕێکخراوەیی و بە پرۆژە کاری بۆ بکەین. بەڵام لە هەمانکاتدا دەبێ ئەو واقعیەتەمان لە بەرچاو بێت کە خێرایی گۆڕانکارییەکان و بەتایبەت تەکنۆلۆژیای ڕاگەیاندن و تەشەنەکردنی ئەم ڕاگەیاندنانە بۆ ناو تەواوی ڕەهەندە جۆربەجۆرەکانی ژیان، بووەتە هۆی ئەوەی کە دەبێ خێراتر لە جاران بکەوینە کۆکردنەوە و لە هەمانکاتدا گەشەپێدان و تازەکردنەوەی شێوە جۆراوجۆرەکانی فۆلکلۆر. شتێك کە لە ڕۆژئاوا خۆی لە شێوەی ڕێکخراوەی نێونەتەوەیی وەکوو یونسکۆ و WIPO [1] نیشانداوە و هەوڵیان داوە بە درووستکردنی ئەم ڕێکخراوانە بتوانن پارێزگار و پاڵپشتی فۆلکلۆر، وەك بەشێکی گرنگی میراتی کولتووری بن و لە هەمانکاتدا ببنە هۆی زیاتر ناساندن، پاراستن و زیندووکردنەوە و گەشەپێدانی ئەم بوارە پەراوێزخراوە. هەر بۆیە بۆ ئەم مەبەستە پەنایان بردووەتە بەر یاسا و ڕشتەیەك بەناوی «مافی فۆلکلۆر»یان دامەزراندوە، واتە لە زانکۆکان دەخوێندرێ و خوێندکاران و خەڵك لەگەڵ گرنگی ئەم بوارە ئاشنا دەکرێن تا ئەو ڕادەیە کە یاسازانەکان دەوڵەتەکانیان هێناوەتە سەر ئەو قەناعەتە کە لە یاسای بنەڕەتی وڵاتەکانیاندا هەندێ یاسای تایبەت بۆ پاراستنی ئەو میراتە فۆلکلۆرییانە بگونجێنن و پێوانەی نێونەتەوەیی ۱۹۸۲ی WIPO و یونسکۆ یەکێ لە بەرچاوترین ئەم هەڵمەت و کارانەیە. هەر بەم شێوە لە جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤدا (۱۹٤۸)، پاراستنی کولتوور وەکوو بڕگەیەك هاتووە، واتە ئەو دەوڵەتانەی کە ئەو گرێبەستەیان واژۆ کردووە، دەبێ پاراستنی کولتوور و خاوەنداریەتی بیر و ئەندیشە دەستەبەر بکەن و هەر بۆ ئەم مەبەستە لە زانکۆکان چەندین ژۆرناڵی گرنگ و زانستییان درووست کردووە و هەر ساڵە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە سەبارەت بەم باسە بەڕێوە دەچێ و مۆزەخانەکانیان ساڵانە نۆژەن دەکەنەوە و چەندین کۆبوونەوە و کارگەی فێرکاری دەکرێتەوە و لە سەر ئاستی جیهانیدا چەندین کۆنفرانس بەڕێوە دەچێ. بۆ وێنە کۆنفرانسی جیهانی ۱۹۹٦ لە تۆکیۆی ژاپۆن یەکێك لەوانەیە. لە ئاکامی ئەم کارەدا لەگەڵ ئەوەی کە میراتی فۆلکلۆری خۆیان پاراستووە و سەر لەنوێ بەرهەمی ئەهێننەوە، لە هەمانکاتدا ساڵانە لەم ڕێگەوە پارە و داهاتێکی زۆر بەدەست دەهێنن.

سەرەڕای تەواوی ئەوشتانەی کە لەسەر گرنگی فۆلکلۆر و ڕەهەندە جۆربەجۆرەکانی هاتە ئاراوە،

---

[1] ـ wipo ڕێکخراوەی جیهانی خاوەنداری تاك.

لەم ساڵانەی دواییدا تا رادەیەك لەم بوارەدا کاری بەنرخ کراوە، بەڵام ئەم کارە زۆر لە ئاستێکی نزمدایە، ئەگەرچی ئەم کارەش لە جێگەی خۆیدا زۆر گرنگە و دەتوانێ ببێتە مەتریالێکی خاو کە لە داهاتوودا پسپۆڕان و شارەزایان دەتوانن لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر بکەن، بەڵام جێگەی خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی کۆمەڵناسی، کولتووری و ئەدەبی لەم بوارەدا زۆر بەرچاوە و بە دەگمەن لەم بوارەدا کارکراوە. کەم کاری لەم بوارەدا ئەگەرچی دەتوانێ چەندین هۆکاری هەبێت، بەڵام بەلای منەوە سەرەکیترین فاکتەری بۆ بزووتنەوەی کولتووری کوردی دەگەڕێتەوە کە بزاڤێکی کۆنەپارێزە و زۆر لە رەخنەگرتن دەترسێ و پێیوایە رابردوو بەگشتی رابردوویەکی زێڕینە و هەرجۆرە رەخنەگرتنێ دەتوانێ ئاسەواری خراپی بەدواوە بێت.

بە ئاوڕدانەوە لە ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو و بەتایبەت بیرمەندانی بواری گەشەسەندن[1] بۆمان دەردەکەوێ کە هیچ کات وڵاتێك یان نەتەوەیەك ناتوانێ بەرەو پێش بچێت و گەشە بسەنێت مەگەر ئەوەی کە خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانە لەخۆی هەبێت، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە ئێمە رابردووی خۆمان بخەینە لاوە و لە بەرچاوی نەگرین، بەڵکوو بە وتەی نووسەری گەورەی ئێرانی سەیدجەواد تەباتەبایی، رێگەی دەربازبوون لە وەها هەلومەرجێك بۆ وڵاتانی وەکو ئێمە (کە مەبەست ئێرانە) ئەوەیە کە بە چاوێکی رەخنەگرانەوە رابردووی خۆمان لێکبدەینەوە، تاکوو دابڕانمان لە نەریت ژیرانە و عەقڵانی بێت. شتێك کە رۆژئاواییەکان بە رووخان و لەنێوچوونی ئیمپراتووری رۆم ئەنجامیان دا (تەباتەبایی، ١٣٨٠)، واتە دەبێ کولتووری خۆمان بەباشی بناسین و بە هەمان شێوە ناسینمان لە تیۆری و شێوەی گۆڕانکاری رۆژئاوا بێت و بە خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی عەقڵانی لە نەریت و کولتوور و بەلاوەنانی لایەنە ناحەز و قیزەونەکانی و لەهەمانکاتدا وەرگرتنی شتە جوانەکانی کولتووری خۆمان و وڵاتانی دیکە، هەوڵ بدەین تاکوو بتوانین لەم بارودۆخە دەرباز بین، واتە ئەگەر خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی ئەوتۆمان نەبێت، رابردوو ئێستای ئێمە بەرتەسك دەکاتەوە و شوناسی ئێمە بەهۆی شتگەلێکەوە درووست دەکرێ کە لە نەوەکانی رابردووەوە بە ئێمە گەیشتووە و ئێمە مەحکووم بە ژیانێکین کە خۆمان لە درووستکردنیدا رۆڵمان نەبووە، واتە نە تەنیا لە سەرەتاوە دەستمان پێی نەکردووە، بەڵکوو پێشوەخت بۆیان درووست کردووین.

سەرەڕای تەواوی ئەم را و رووە کە لەسەر فۆلکلۆر بەگشتی و پەند و قسەی پێشینیان هێنامانەوە، ئێستا پرسیارێکی گرنگ کە ئەم نووسراوە هەوڵ ئەدا وەڵامی بداتەوە ئەوەیە: پەند و

---

١. Development

**مەتەڵ و قسەی پێشینیان وەکوو بەرهەمێکی زەینی مرۆڤ کە بەدرێژایی مێژوو درووست بووە و ئەمڕۆ وەکوو میراتێك بۆ ئێمە ماوەتەوە، واتە ئەگەرچی ئەم میراتە هزرەیە بۆ کۆمەڵگای سەردەمی خۆی زۆر باش و بەکەڵك بووە و هەڵگری هەلومەرج و بارودۆخی ژیانی خەڵکی ئەو سەردەمە بووە، بەڵام بەهۆی گۆڕانی ژێرخان و بنەماکانی کۆمەڵگای کوردی و دەربازبوون بەرەو مۆدێرنیتە، ئەدەبی زارەکی و فۆلکلۆر (پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان) وەکوو بەشێك لە سەرخانی کۆمەڵگا تا چەندە دەتوانێ وڵامدەری پێداویستی ژیانی ئەمڕۆ بێت؟ ئەمجۆرە هزر و بیرە تا چەندە لەگەڵ بەها و ئەرزشەکانی مۆدێرنیتە و سەردەمی ئەمڕۆ کە بریتییە لە سەروەری عەقڵ، ئازادی، بەرابەری، مافی تاك، رەخنەگرتن، پێشکەوتن و دێموکراسی یەك دەگرێتەوە؟ تا چەندە ئەم هزر و بیرانە دەتوانن یارمەتیدەر بن بۆ بە دێموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا بەگشتی و گرێدانی دێموکراسی بە کولتوورەوە؟**

* * *

## فۆلکلۆر چییە؟

لەسەر چەمکی فۆلکلۆر (Folklore)، وەکوو هەر چەمکێکی دیکەی کومەڵایەتی و کولتووری پێناسەی جیاواز لە ئارادایە و لە نێوان شارەزایانی ئەم بوارەدا هەر کەسێك بە جۆرێك ئەم چەمکەیان پێناسە کردووە و خستوویانەتە بەرباس و شرۆڤەکردن. بەڵام لە نێوان ئەم پێناسە جۆراوجۆرانەدا بە گشتی هەندێ خاڵی هاوبەش هەیە کە هەموویان هەریەك بە شێوەیەك پێداگری لەسەر دەکەن، ئەگەرچی من لێرەدا نامەوێ بچمە ناو ئەم وردەکارییانەوە.

چەمکی فۆلکلۆر چەمکێکی زۆر کۆن نییە، ئەگەرچی حیکایەت لە شتی زور کۆن دەکا. وشەی فۆلك (Folk) بە مانای خەڵك، لۆکاڵی و عەوامانە بەکارهێنراوە و لۆر (Lore) بەمانای (زانست و ئاگاهی) هاتووە، واتە فۆلکلۆر بەگشتی بە مانای «کولتووری خەڵك» و «کولتووری عەوامانە» (رەشۆکی) هاتووە (دێهخودا، ١٣٧٥ : ٩١١٦).

وشەی فۆلکلۆر بۆ یەکەمین جار لە لایەن ویلیام تامزی (William Thams) ئینگلیزی، کارناسی کەلوپەلی کۆن لە ساڵی ١٨٤٦ زایینی بەکارهاتووە (ماڵپەڕی ویکیپێدیا). ناوبراو لە نامەیەکدا بۆ خەڵکی ئاتێن دەنووسێ بۆ لەمەو بەدوا بە جێگەی بەکارهێنانی وشەی داب و نەریتی رەشۆکی (Popular antiquities) یان «ئەدەبیاتی رەشۆکی» (Popular Literature)، وشەی فۆلکلۆر بەکار بهێنن (حەبیبی، ١٣٨٨: ١٣). دەتوانین بڵێین فۆلکلۆر لای ویلیام تامز بەگشتی کردەوە، ئەرك، داب و نەریت، جۆك، خۆرافات، پەندی پێشینیان، قسەی نەستەق، سیحر و جادو و ئەدبی زارەکی و هەموو شتێکی کۆن لەخۆ دەگرێ. (ماڵپەڕی وی‌سی‌جیك).

لە پێناسەیەکی دیکەدا کە لە لایەن ڕێکخراوەی WIPO و یونسکۆ لەسەر فۆلکلۆر کراوە، «فۆلکلۆر کۆیەك بەرهەمی زەینی مرۆڤە کە کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگایەکی دیکە جیادەکاتەوە و هەندێ بابەتی وەکوو چیرۆك، شیعر، ئەدەب و ئەفسانەی ناوچەیی و لۆکاڵی، نووسین، هێماکان، ئاسەواری هونەری، کەرەسەی موزیك ژەندن و پیشەی دەستکرد، خانووبەرە درووستکردن، ئاسەوارە مێژووییەکان، شێوەی مێعماری و هەندێ شتی دیکەی لەم بابەتە دەگرێتەوە» (حەبیبی، ١٣٨٨: ١٥). لە پێناسەیەکی دیکەدا، کریستیەن ئەلیسۆن پێیوایە «چەمکی فۆلکلۆر لەناو کورداندا زۆربەی کات بە مانایەکی بەربڵاو هاتووە و زۆر شتی وەکوو کردار و شتە نەریتییەکان لەخۆ دەگرێ و دەتوانێ فۆڕمی کولتووری مادی و هونەری لەخۆ بگرێ» (ئەلیسۆن، ١٣٨٤: ٨٥)، ئەگەرچی مەبەستی ئێمە لێرەدا بەشی مادی کولتوور نییە. بەڵکوو لەم باسەی ئێمەدا مەبەست لە فۆلکلۆر ئەدەبی زارەکی (Oral Literature) یان درووستتر بڵێین هونەری زارەکییە (Verbal art)، چونکە پەند و قسەی پێشینیان و مەتەڵ دەچێتە ئەم خانەیەوە.

لە دوای پێناسەکردنی چەمکی فۆلکلۆر وەکوو چەمکێکی گشتی و بەربڵاو دەمەوێ بێمە سەر باسی پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان کە وەکوو بەشێکی فۆلکلۆر بەئەژمار دێت. چەمکی پەندیش زۆر باسی لێکراوە و چەندین پێناسەی لێکراوە. لە بەرانبەردا کەسانێك وەکوو تارکێر تایلۆر، میدر، پیتەر گریزبەك و دێهخودا پێیان وایە کە پەند پێناسە ناکرێ. بۆ وێنە میدر دەڵێ: «دەتوانم بڵێم ڕادەی پێناسەی پەندەکان زۆرتر لە خودی پەندەکانە» (پارسا، ١٣٨٧: ٩). هەروەها بابەك ئەحمەدی دەڵێ: «داهێنەرەی پەندەکان نەناسراون، بەڵام لەلایەن هەموو خەڵکەوە قەبووڵ کراون. سەرەکیترین تایبەتمەندی پەند لە نێوان هەر میللەتێکدا خۆیەخۆیبوون، واتە هەڵقوڵاوی ناو هەناوی کۆمەڵگا، دووپاتبوونەوە و خەڵکیبوونیانە. هەروەها کەسانێك وەکوو مامۆستا عەلائەدین سەجادی پێیان وایە کە لە نێوان پەند و قسەی نەستەقدا جیاوزای هەیە، واتە پەند داهێنەری دیاری نییە، بەڵام قسەی نەستەق داهێنەرەکەی ناسراوە.» (سەرچاوەی پێشوو، ١٣٨٧).

لە کۆبەندی ئەو شتانەی کە گوترا دەتوانین بڵێین پەند ئاوێنەی باڵانوێن، ئەرشیڤی بیری مێژوویی هەر میللەتێك، ڕەنگدانەوەی داب و نەریت، خوو و ڕەوشت، نەریتی باو و باپیران، شێوەی ژیان و مانابەخشین بە ژیان و دواتر دەکرێ بڵێین هێمای ڕاستەقینەی نەتەوەیە. پەند و قسەی پێشینیان میراتی کولتووری و گەنجینەیەکی تاقانەی پڕبایەخی مەعنەوییە کە بۆ ڕابردوویەکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە تا ئەو جێگەیە کە هەندێ کەس پێیان وایە پێش لە بەدیهاتنی خەت و نووسین، سەریهەڵداوە. بە کورتی دەتوانین بڵێین پەند و قسەی پێشینیان ڕەنگدانەوەی خۆشی و ناخۆشی،

چاکی و خراپی کۆمەڵایەتی ئێمەن.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا پێناسەی مەتەڵ دەخرێتە بەرباس کە بۆ ئەم باسەی ئێمە پێویستە. مەتەڵ (Puzzle)، یەکێك لە جۆرەکانی دیکەی فۆلکلۆرە و نیشانە و تایبەتمەندی شتێکە، بێ ئەوەی کە ناوێك لە شتەکان ببەن لە بیسەر پرسیار دەکرێ و مەبەست لەم کارە لە راستیدا جۆرێك هەڵسەنگاندنی هۆشی بیسەر و کێبەرکێیە و زۆرتر بە وشەی «چییە» دەست پێدەکا، بە واتایەکی دیکە "مەتەڵ قسەیەکی پۆشراوەیە لە وەسف و هەڵسەنگاندنی شتێك لەگەڵ شتێکی دیکەدا یان شتانێکی دیکەی بە تەواوی جیاواز" (ئەحمەدی، ١٣٨٩: ١١).

* * *

## رابردووی لێکۆڵینەوە[١]

هەر نووسین و لێکۆڵینەوەیەك دەبێ تا رادەیەکی زۆر بۆ پەرەپێدان و تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکانی پێش خۆی ئەنجام بدرێ. لێکدانەوەی رابردووی باس و بابەتەکان دەتوانێ ئاسۆیەکی روون و بەرفراوان بە رووی لێکۆڵەردا بکاتەوە و لێکۆڵەر دەبێ بە چاوێکی رەخنەگرانەوە بڕوانێتە بابەتەکانی پێش خۆی و خاڵی لاواز و بەهەمان شێوە خاڵە باش و ئەرێنییەکان لەو کارانەدا دەستنیشان بکات و لە کۆتاییدا دەبێ بۆ خۆی کارێکی جیاواز لە کارەکانی پێشوو بخاتە روو.

لە پەیوەندی لەگەڵ فۆلکلۆردا بە چاوخشاندنێك لە **کتێبی بیبلیۆگرافیای فۆلکلۆری کوردی**، ئامادەکردنی بوار نورەددین، چاپی ئەنستیتۆی کەلەپووری کوردی، بۆمان دەردەکەوێ کە چەندین کتێب و نووسراوە لەم بوارەدا هەیە کە بەهۆی کەمی کات و دەرفەت ناکرێ هەمووی باس بکرێ و لە هەمانکاتدا پێویست بە وەها کارێکیش نییە. بەڵام سەبارەت بە بابەتی ئەم کتێبە، واتە پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان دەکرێ هەموو ئەو نووسراوانەی کە لەم پەیوەندییەدا هەیە بکرێنە دوو بەشەوە:

یەکەم: ئەو کتێب و نووسراوانەی کە بە گشتی پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیانیان کۆکردووەتەوە و بەشێوەی جوراوجۆر تۆماریان کردووە. ئەم بەشە بە زۆری کۆکردنەوە، تەوسیفکردنی پەندی پێشینیان، نیشاندانی رەهەندە جۆربەجۆرەکانی پەند و مەتەڵ لەخۆ دەگرێ. دەبێ ئەوە بگوترێ ئەگەرچی لەم بەشەدا کاری زۆر باش کراوە، بەڵام لە ئاستی دەوڵەمەندی فۆلکلۆری کورددا نییە کە لە ژێرەوە ئاماژە بە بەشێکی گرنگی دەکەین: کۆنترین بەڵگە، بەرگێکی

---

١. Review of Litrature

دەسنووسە کە لە ساڵی ١٧١١ لە ئەرمەنستان بە زمانی ئەرمەنی نووسراوە و کۆکراوەتەوە و نووسەرەکەی نادیارە، دووهەمین سەرچاوە (بەرگێکی دەسنووسە) کە مەلا مەحموودی بایەزیدی کۆیکردۆتەوە، هەروەها چەندین سەرچاوەی دیکە وەکوو لێکۆڵەری ئەرمەنی کیس ئایگۆنی (١٩٠٨ - ١٨٣٨)ی زایینی یەگیزارۆف (١٨٧٨)، فۆن لکۆك رۆژهەڵاتناسی ئاڵمانی (١٩٠١)، هۆگۆمکس (١٩٢٦)، ئیسماعیل حەقی شاوەیس (١٩٣٣)، مامۆستا عەلائەدین سەجادی (١٩٥٢)، شێخ محەمەد خاڵ (١٩٥٧)، دکتۆر عێزەدین مستەفا رەسوڵ (١٩٧٠)، دکتۆر شوکریە ئیبراهیم رەسوڵ (١٩٨٤)، شێخ محەمەد مەردوخ کوردستانی، مەلا غەفووری دەباغی، قادر فەتاحی قازی (١٣٦٥)، بنەڕەتی مەتەڵی کوردی ئیبراهیم ئەفخەمی (پارسا، ١٣٨٧: ٧٢ - ٥٨)، فەرهەنگی مەتەڵ و لیچاری کوردی ئیبراهیم ئەحمەدی (١٣٨٩) و چەندین کتێبی دیکە سەبارەت بەم بابەتە کە ناکرێ لێرەدا بە هەموویان ئاماژە بکەین، بەڵکوو دەتوانین بڵێین ئەوانەی کە لێرەدا ئاماژەیان پێکراوە، زۆر بەرچاو و ناسراون.

**بەشی دووهەم:** ئەو کتێب و نووسراوانە لەخۆ دەگرێ کە زیاتر جەختیان لەسەر تەبیین و روونکردنەوەیە. واتە زۆرتر ئەو لێکدانەوە و توێژینەوانە لەخۆ دەگرن کە بە زۆری جەخت لەسەر هۆکارەکان، چۆنیەتی درووستبوون و سەرهەڵدان، کارایی و فۆنکسیۆن (Function) و هەروەها لایەنە لاواز و باشەکانی پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان دەکەن. دەتوانم بڵێم ئەوکارانەی کە لەم بوارەدا کراون بە تایبەت لەسەر ئەم بابەتەی ئێمە، ئەگەرچی زور پێویست و بنەڕەتین، بەڵام بەداخەوە زۆر کەمن و وەك دەڵێن بە قامکی دەست دەژمێردرێن کە لە ژێرەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

**یەکەم:** نووسراوەیەك لە مامۆستا ئەمیری حەسەنپوور بە زمانی ئینگلیزی لە ژێر ناوی: The (Re) Production of Patriarchy in the Kurdish languge، واتە دوبارەبوونەوەی باوكمەزنی لە زمانی کوردیدا، دەکرێ بڵێین ئەم لێکۆڵینەوە، یەکێك لەو سەرچاوە دەگمەن و بەنرخانەیە کە تا بە ئەمڕۆ لە ئەدەبی کوردیدا بەگشتی لەسەر زمان و بە تایبەت ئەدەبی فۆلکلۆر کراوە. ناوبراو لە روانگەی گوتاری زمانناسی رەخنەگرانەوە و بە پشتبەستن بە قامووسی زمانی کوردی زەبێحی، فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە، هەندێ پەند و قسەی نەستەقی کوردی لێکداوەتەوە. مامۆستا حەسەنپوور پێیوایە کە زمانی کوردی بەگشتی زمانێکی بێلایەن نییە، بەڵکوو زمانێکی پیاومەزن و لە هەمانکاتدا دژ بە ژنە. هەروەها ناوبراو پێیوایە بۆ دێموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا دەبێ ئێمە روانگەیەکی رەخنەگرانەمان لە هەموو بوارەکاندا هەبێ، بە تایبەت سەبارەت بە زمان پێیوایە تا کاتێك ئەو وشە و چەمك و دەستەواژانە نەکەونە بەر شاڵاوی رەخنەگرتن و هەڵتەوەشێنەوە،

باوکمەزنی هەروەها لە ڕێگەی گۆرانی، قسە و کاروباری ڕۆژانـەوە و زۆر شـتی دیکـەی لـەم بابەتـە دووپات دەبێتەوە (حەسەنپوور).

**دووهەم:** بابەتێکە لەژێر ناوی **«کولتووری گەشە لە ئەدەبیاتی کوردیدا»** لە نووسینی مسـتەفای ئەزکیا و بە هاوکاری سولەیمان پاك سرشت. لەم لێکۆڵینەوەدا ویستوویانە رۆڵ و کاریگەری فاکتەری کولتووری لە ئەدەبیاتی کوردیدا لێکبدەنەوە. کۆمەڵگای ئاماری ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتیە لە ٣٨٠٠ پەنـدی کـوردی لـە کتـێبی قـادری فـەتاحی قـازی کـە بـە هەڵکـەوت ١٨٠٠ پەنـد هەڵبـژێردراوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. گریمانەی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوە ئەوەیە کە ژمارەی هۆکار و فاکتـەری فەرهـەنگی نـەرێنی و نێگـەتیڤ لـە پەنـدی کوردیـدا، زیـاترە لـە فاکتـەری ئـەرێنی و پـۆزەتیڤ. دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوە لە دژی گریمانەکەیە، واتە ژمارە و ڕادەی فاکتەر و نـاوەرۆکی پـۆزەتیڤ ٦٢/٤ لە سەدە و لە بەرانبەردا فاکتەری نەرێنی و نێگەتیڤ ٣٧/٦ لەسەدە و پێیان وایە ئـەم هۆکـارە دەتـوانی پاڵنـەرێکی بـاش بێـت بـۆ گەشـەی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی کۆمـەڵگای کـوردی، واتـە دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوە بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی هەندێك لە بیرمەندانی رۆژئاواییە کە پێیان وایە بەستێنی کولتووری کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتن لەبار و گونجـاو نییـە و دەبێ بە یەکجاری بەلاوە بنرێ (ئەزکیا، ١٣٧٧: ٢٦ـ٢٨)

**سێهەم:** وتارێکە لە نووسینی کریستیەن ئەلیسـۆن (١٣٨٤) لـەژێـر نـاوی **«فۆلکلـۆر و فـانتیزی: رۆڵی ژن لە ئەدەبی زارەکی کوردیدا»**. ئەگەرچی ئەم توێژینـەوە راسـتەوخۆ پەیوەنـدی بـە باتەکـەی ئێمەوە نییە، بەڵام بە گشتی دەتوانین بڵێین کارێکی جوانە و تا رادەیەك یارمەتیدەرە بۆ ئـەم باسـەی ئێمەیە. ناوبراو پێیوایە لە ئەدەبی زارەکی کوردیدا واتە چیرۆك و گـۆرانی، ژنـان رۆڵـی سـەرەکییان هەیە و جێگە و پێگەی ژنان لە ئەدەبی زارەکی کوردیدا شتێکی حاشاهەڵنەگرە.ئەلیسۆن پێیوایە کە ژنان لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا هێز و دەسەڵاتێکی بەرچاویان هەیە. (ئەلیسۆن: ١٣٨٤).

ئەگەر بە وردی چاوێك لەم نووسراوانە بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە لەبەشـی یەکەمـدا سـەرەڕای ئەوەی کە زۆر کاری گـرنگ و پڕبایـەخ ئـەنجام دراوە. بـەڵام وەك خـاڵێکی لاواز دەبـێ ئامـاژە بـەوە بکەین ئەگەرچی کۆکردنەوەی ئەم بابەتانە پێش‌مەرجێکی پێویستە، بـەڵام هەرکۆکردنـەوە بـە تـەنیا بەس نییە و دەبێ لە لایەنی جۆراوجۆرەوە بخرێتە بەر تیشـکی لێکدانـەوە. لـە بەشـی دووهەمـدا بـە تایبـەت نووسـراوەی کـاك ئـەمیری حەسـەنپوور و ئـەزکیا دوو کـاری زانسـتی و میتـۆدیکن، بـەڵام کۆمەڵێك دەرئەنجامی دژ بە یەك و ناکۆکیان لەگەڵ یەکدا هەیـە. حەسـەنپوور پێیوایـە کـە بـەهوی باوکمەزنی لە زمانی کوردیدا، بـاوکمـەزنی و دەسـەڵاتی پیـاوان بـە شـێوەی ڕۆژانـە و لـە ڕێگـەی

جۆراجۆرەوە دووبارە دەبێتەوە و ژنان وەکوو نیوەی کۆمەڵ دەخرێنە پەراوێزەوە. لە بەرانبەردا ئەزکیا پێیوایە کە فەرهەنگی کوردی بەستێنێکی کولتووری لەبارە بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتن. بەڵام لێرەدا پرسیارێك کە رووبەڕووی لێکۆڵینەوەی ئەزکیا دەبێتەوە ئەوەیە: لە کولتوورێکدا کە باوکمەزنی زاڵە و نیوەی زیاتری حەشیمەتی وڵاتەکە دەخاتە پەراوێزەوە، چۆن دەتوانی بەستێنێکی لەباربێت بۆ گەشەسەندن و پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی؟ هەر هەمان دەرئەنجام لە نووسراوەکەی ئەلیسۆن بە شێوەیەکی دیکە دووبارە دەبێتەوە و پێیوایە ژنان رۆڵی سەرەکییان لە ئەدەبی فۆلکلۆردا هەیە. بەڵام بابەتێك کە لەم توێژینەوانەدا زۆر بەرچاوە، ئەوەیە کە هەموویان بە جۆرێك لە باری تیۆرییەوە زۆر تۆکمە و بەهێز نین، واتە بۆ دەربڕینی هۆکارەکان و لێکدانەوەی ئەم بابەتە تیۆرییەکی فرەڕەهەند و بەربڵاوتر پێویستە. بەڵام لەم توێژینەوانەدا هەر یەکەو لە روانگەیەك یان بە پێی تیۆرییەکی دیاریکراو بارودۆخی کۆمەڵگای کوردی لێکداوەتەوە. بەڵام لەم پێشەکی و لێکدانەوەدا بۆ روونکردنەوەی زۆرتری ئەم بابەتە لە کۆمەڵێك تیۆری کەڵك وەرگیراوە تا ئەم کەم و کوڕییانە دووپات نەبێتەوە.

* * *

## تیۆری لێکۆڵینەوە

بۆ ئەوەی کە بتوانین بەشێوەیەکی باشتر لە تەوەری ئەم لێکۆڵینەوە تێبگەین و شرۆڤەی بکەین، پێویستمان بە بنەما و چوارچێوەیەکی تیۆری هەیە کە لێرەدا هەوڵ دراوە بە گوێرەی پێویست بخرێتە بەرباس و لێکدانەوە.

هەروەها کە لە سەرەتای باسەکەدا ئاماژەمان پێدا، پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان بەگشتی دەچێتە خانەی ئەدەبی فۆلکلۆر و فۆلکلۆریش بۆخۆی دەچێتە خانەیەکی گەورەترەوە بە ناوی کولتوور. هەر بۆیە، بۆ شرۆڤەکردن و لێکدانەوەی ئەم بابەتە ناچارین لەو تیۆرییانە کەڵك وەربگرین کە بەگشتی لەسەر فەرهەنگ دوواون و پێداگری دەکەن. چونکە تیۆرییەکی وا لە بەردەستدا نییە کە راستەوخۆ بتوانین باسەکەمانی پێ لێکبدەینەوە.

لەسەر پێناسە و بایەخ و گرنگی کولتوور (Culture) زۆر شت نووسراوە. چەمکی کولتوور یەکێك لەو چەمکانەیە کە زۆر بەکار دەبرێ و لە هەمانکاتدا پێناسەی زۆری لێکراوە. ئەگەر بمانەوێ پێناسەیەکی گشتی لە کولتوور بکەین دەتوانین بڵێین هەر شتێك کە مرۆڤ دایهێناوە و جیاوازە لە شتە سرووشتی و خۆڕسکەکان (پین، ١٣٨٢: ٤٢٤). لەسەر گرنگی پێگەی کولتوور هەر لە کۆنەوە لە نێوان بیرمەنداندا مشت و مڕێکی زۆر لە ئارادا بووە و ئێستاش هەر بەردەوامە و

دەتوانین بڵێین کولتوور یەکێك لەو چەمکانەیە کە بووەتە هۆی دروستبوونی سنوورێك بۆ جیاکردنەوەی بیرمەندان لە یەکدی و ئەوانی لە دوو جەمسەری جیاوازدا داناوە، واتە ئەوانەی کە گرنگی و ڕەسەنایەتی بە کولتوور دەدەن و پێیان وایە کولتوور سەرچاوەی هەموو گۆڕانکارییەکە و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کولتوور بنەڕەت و ئەساسە. لەم جەمسەرەدا کەسانێکی وەکوو دێکارت، هێگل، ماکس وێبێر و ... هەڵکەوتوون. بەڵام لایەنی بەرانبەر پێیان وایە کە مادە یان بە وتەیەکی دیکە، هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی فاکتەری بنەڕەتی و سەرەکی هەموو گۆڕانکارییەکە، واتە ئەوە هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتییە کە بیر و ئەندێشە دەخوڵقێنێ. ئەگەرچی لایەنگرانی ئەم ڕێبازە فیکرییە پێیان وایە پەیوەندییەکی دیالێکتیکی لە نێوان ژێرخان (هێز و پێوەندی بەرهەمهێنان) و سەرخان (کولتوور، سیاسەت، یاسا و ...) لە ئارادایە، بەڵام لە کۆتاییدا هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕۆڵی دیاریکەری هەیە. پێشەنگی ئەمجۆرە بیرۆکەیە کارڵ مارکسە و دواتر کەسانێکی وەکوو لویس کۆزر[1] و کارل مانهایم[2] لەگەڵ دەستێوەردانی هەندێ ئاڵوگۆڕ لە ئەندێشەی مارکسدا برەویان بەم ڕەوتە دا تا ئەو ڕادەیە کە کۆزر و مانهایم بە هۆی گرنگی و بایەخ دان بەم جۆرە بیرۆکەیە بوونە هۆی دروستبوون و داهێنانی لقێکی دیکە لە کۆمەڵناسیدا بە ناوی «**کۆمەڵناسی مەعریفەت**» (Sociology of Knowledge) و بە خەستی پەیوەندی نێوان زەینی مرۆڤ و هەلومەرجی کۆنکرێتیان خستنە بەرباس. لێرەدا کولتوور وەکوو بەرهەمی زەینی کەوتە بەرباس و لێکدانەوە تا ئەو جێگە کە مانهایم پێی وابوو مەعریفە بەگشتی و تەواوی ئایدیاکان پەیوەندیان بە پێگەی کۆمەڵایەتییەوە (Bound to Alocation) هەیە. (کۆزر، ١٣٧٣: ٢١٦).

بە کورتی دەتوانین بڵێین ترۆپك و لوتکەی ئەم بیرۆکەیە لە سەردەمی مۆدێرندا لە باسەکانی کارڵ مارکس و ماکس وێبێردا بە تایبەت لە کتێبی «ئەخلاقی پرۆتێستان و ڕۆحی سەرمایەداری» خۆ دەبینێتەوە. ئەگەرچی لە دوای ئەم دوو بیرمەندە، هەندێك بیرمەندی دیکە هاتوون و پێیان وابووە هەر دوو بیرۆکەکە لەگەڵ ئەوەی کە زۆر شتی باشیان هەیە، بەڵام هەردووکیان بە جەختکردن لەسەر لایەنێك، لایەنێکی دیکەیان پشتگوێ خستووە. هەربۆیە دواتر ڕەوتێکی نوێ لە کۆمەڵناسیدا هاتە ئاراوە کە بە «**ڕێبازی تێکڵاو**» ناسراوە. شوێنکەوتووانی ئەم ڕێبازە باوەڕیان بە جۆرێك لە ئەندێشە

---

١- Lewis A. Coser

٢- Carl Mannheim

و بیرە کە بۆ گاڵتە «مارکس وێبێر»ی پێ دەڵێن، واتە تێکلاوێك لە هەردوو ئەندێشەی مارکس و وێبێر.

لە دوای ئەم سەرەتا کورتە لەسەر کلتوور ئێستا دێینە سەر باس لەو تیۆریانەی کە تا رادەیەکی زۆر دەتوانن باسەکەی ئێمە روون بکەنەوە کە لە ژێرەوە دەخرێنە بەرباس.

* * *

## زیگمۆند فرۆید[1]

لە دونیای ئەمڕۆدا کەڵك وەرگرتن لە ئەندێشەی دەروونشیکاری[2] بۆ تێگەیشتن لە دیاردە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان شتێکی زۆر باوە. یەکێك لەو بیرمەندانە کە لەم بوارەدا زۆر ناسراوە زیگمۆند فرۆیدە. فرۆید لە کتێبی «**دەرئەنجامە ناخۆشەکانی کولتوور**» کە بەرهەمی دواساڵەکانی ژیانیەتی، هەوڵ ئەدا بەپێی ئەو دەسکەوتانە کە «لە بواری دەروونشیکاری» و لێکدانەوەی «ژیانی جنسی مرۆڤ» بە دەستی هێناوە، خوێندنەوەیەك لەسەر چۆنیەتی درووستبوونی کولتوور و شارستانییەت نیشان بدات. فرۆید پێی وایە پرۆسە و رەوتی گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی کولتوور هاوکاتە لەگەڵ داپڵۆسین، سەرکوت و بەرپەرچدانەوەی غەریزەی جنسی. بە وتەی فرۆید دەسپێراگەیشتنی مرۆڤ بە لووتکەی کولتوور و شارستانییەت بە قیمەتی داپڵۆسین و سەرکوت و کونترۆڵی بێبەزییانەی «مەیل و ئارەزووی غەریزی» و لە هەمانکاتدا نارەزایەتی و دڵساردکردنەوەی مرۆڤ، تەواو بووە. بە بڕوای فرۆید، مێژووی مرۆڤایەتی، مێژووی سەرکوتکردنی مرۆڤە. فرۆید پێی وایە کولتوور لە رێگەی بەکۆمەڵایەتیکردن، یاسا و هەندێك یاسای تایبەت، داب و نەریت، تابۆ «حەرام» و یاساخکردنی زۆر شتی دیکەی لەم بابەتە، دەیهەوێ لەمپەر و بەربەستگەلێك بۆ بەرتەسککردنەوەی حەز و خولیای مرۆڤ و بەتایبەت بەرتەسککردنی ژیانی «جنسی» دابهێنێ. فرۆید پێی وایە لە دەرئەنجامی ئەم سەرکوتکردنەدا ئەگەرچی حەز و خولیای مرۆڤەکان سەرکوت دەکرێن، بەڵام لەنێو ناچن، بەڵکوو دزە دەکەنە نەستی «ناخودئاگا»ی مرۆڤەکانەوە و دواتر لە هەندێ دەرفەتی دیکەدا لە رێگەگەلێکی دیکەوە بە شێوەی جۆراوجۆر خۆیان دەرباز دەکەن بە تایبەت لە کاتێکدا کە سانسۆڕ و کۆنترۆڵ لەسەر مرۆڤ نامێنێت (فرۆید: ١٣٨٤). بۆ وێنە لە کاتی خەوتن لە رێگەی خەوبینین و هەندێ دەرفەتی دیکەدا، دزە دەکەنە ناو

---

٣. Sigmund Freud

٤. Psycho-analysis

فەزای نافەرمی ژیان کە دەتوانین بڵێین فەزای فۆلکلۆر (پەند و مەتەڵ)، یەکێك لەو فەزایانەیە کە تا رادەیەکی زۆر لە ژێر کۆنترۆڵ و هەیمەنەی فەرهەنگی فەرمی بەدووره و حەشارگەیەکە بۆ داڵدەدانی ئەو بابەتە حەرامانە. بە چاولێکردن لە فەزای فۆلکلۆری کوردی بەگشتی و ئەو بابەتەی ئێمە، واتە پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم فەزایە جێگەی رەبازێن و تراتێنی حەز و خولیا سەرکوتکراوەکانی مرۆڤ و بە تایبەت حەز و خولیای «جنسی»یە. هەر بۆیە دەبینین فەزای پەند و قسەی پێشینیان ئاخنراوە لە سێکس، پێکەنین، تیتاڵێکردن و ترۆکردنی داب و نەریت و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و هەر شتێکی فەرمی بەگشتی و بەربەرەکانێ لەگەڵ هەرجۆرە دەسەڵاتێکی زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا.

فرۆید پێی وایە کە هەموو کۆمەڵگاکان بە شێوەیەکی یەکسان ئەم رێگەیە نابڕن، بەڵکوو ئەم رەوتە لەژێر کاریگەری پێکهاتەی ئابووری و دەروونناسی کۆمەڵگادا دەگۆڕدرێ. کۆمەڵگای کوردیش وەکوو کۆمەڵگایەکی رۆژهەڵاتی، ساڵەهایە لەژێر کۆنترۆڵ و هەیمەنەی کولتووری خێڵەکی، ئایینی و سیاسیدا بووە، هەربۆیە دەتوانین بڵێین فەزای نافەرمی لە کۆمەڵگای کوردیدا وەکوو ئەڵتەرناتیڤی ژیانی فەرمی، گەلێك بەربڵاو و فرەڕەهەندتر لە فەزای فەرمییە. بەپێی ئەم لێکدانەوەیە بە دڵنیایەوە دەتوانین بڵێین ناسینی مرۆڤی کورد لەم رێگەوە گەلێك قووڵتر لە کولتووری فەرمییە. بە پشتبەستن بەو باسە تیۆریکە کە فرۆید هێناویەتە ئاراوە و هەروەها ئەو تایبەتمەندییانەی کۆمەڵگای کوردی، بەو ئاکامە دەگەین کە کۆمەڵگای ئێمە، کۆمەڵگایەکە تا سەر ئێسقان کۆنترۆڵکراوە و خولیا و حەزەکانی خەڵك و بە تایبەت «غەریزەی جنسی» سەرکووت و بەرتەسك کراوەتەوە. هەربۆیە تا رادەیەکی زۆر رەنگدانەوەی ئەم شتانە لەناو پەند و قسەی کوردیدا بەرچاوە، دەتوانین بۆ سەلماندنی ئەم قسانە بە چەندین نموونە لە ناوەرۆکی ئەم کتێبەدا ئاماژە بکەین و خوێنەر خۆی دەتوانێ بە خوێندنەوەی ئەم پەندانە سەبارەت بەم بابەتە داوەری بکات.

* * *

## میخاییل باختین[1]

میخاییل میخائیلۆویچ باختین (١٨٩٥ـ١٩٧٥) نووسەری بەناوبانگی رووسی کە لە دونیای زانستیدا بە «**تیۆری داڕێژی ئەدەبی و زمانناس**» ناسراوە. باختین زۆربەی ژیانی بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر هەندێ نووسەر، وەکو رابلە، گوتە، داستایۆفسکی، تۆلستۆی و کەسانێکی دیکە تەرخان

---

١. Mikhail Bakhtin

کردووە و لە هەوڵی ئەوەدابووە تا لە ناخی ئەدەبیاتی مۆدێرنەوە، تیۆرییەکی ئەدەبی نوێ بهێنێتە ئاراوە. ئەگەرچی بەهۆی هەلومەرجی سیاسی نالەباری ئەودەم، واتە سەردەمی ستالین، نەیتوانیوە یان ئەوی کە نەیویستووە لە بواری زانستی و سیاسیدا دەست بداتە قەڵەم. هەربۆیە ناوبراو لە سەردەمی خۆیدا زۆر بە نەناسراوی مایەوە، بەڵام لە کۆتایی ساڵەکانی ۱۹۹۰ بەدواوە لە کۆڕوکۆبوونەوەی زانستی و ئاکادێمیکدا ناو و ناوبانگێکی تازەی بەدەست هێنا و بیروبۆچوون و نووسراوەکانی، بوونە سەرچاوەیەك بۆ تیۆری کۆمەڵایەتی و سیاسی. بە تایبەت لەسەر بنەما و ئەساسی تیۆرییە ئەدەبییەکانی، بەرهەمگەلێکی باش سەبارەت بە دیمۆکراسی بەدیهات، واتە لە ڕێگەی گرێدانی دیمۆکراسی بە زمان و کولتوورە بە ئەنجامی گەیاند. کارێك کە لە سەردەمی باختیندا شتێکی نامۆ بوو و ئەمڕۆ هەندێك لە بیرمەندان، وەکوو ڕەخنەیەك ئاراستەی دێموکراسی لیبڕاڵی دەکەن کە گوایە دێموکراسی خۆی بە ژمارەیەك دام و دەزگاوە (تایبەتمەندی چەندایەتی دێمۆکراسی) بەستووەتەوە، بەڵام لە بەرانبەردا کەسانێك وەکوو هابێرماس و باختین دێموکراسی گرێ دەدەن بە زمان، پانتایی گشتی و تێکستەکانەوە، واتە (تایبەتمەندی چۆنیەتی دێمۆکراسی) کە دواتر بە کورتی ئاماژەی پێدەکەین.

سەرەکیترین چەمك و تیۆری لە بەرهەمەکانی باختیندا کە گرنکییەکی تایبەتی هەیە و تا ڕادەیەك دەتوانێ تیشك بخاتە سەر باسەکەی ئێمە، چەمکی کەرنەڤاڵە (Carnivale) کە باختین لە نووسراوەکانی رابلەدا بەدوایدا دەچێ و لێی دەگەڕێ. مەبەستی باختین لە کەرنەڤاڵ، کەرنەڤاڵ لە سەدەکانی ناوەڕاستدایە و پێی وایە لەگەڵ کولتووری کەرنەڤاڵی ئەمڕۆ کە بەسەر ڕۆژانی پشوودا زاڵە، زۆر جیاوازە و بە تەنیا لە ناوەکەیاندا خاڵی هاوبەشیان هەیە، نە لە ڕووی تایبەتمەندی و ناوەڕۆکەوە. دەتوانین بڵێین کولتووری کەرنەڤاڵی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتاکانی سەردەمی ڕێنسانس «هەموو جیاوازییەکی پلەوپایە، لەمپەر و بەربەستی نێوان مرۆڤەکان و هەموو ئەو شتە یاساخ و قەدەغەکراوانەی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ بە شێوەی هەڵواسراوەیی دەهێڵێتەوە». (ئەنساری، ۱۳۸٤: ۲۰٦) باختین لە کولتووری «خەڵکی ڕەشۆکی» ئەورووپای سەرەتای سەردەمی مۆدێرن، داب و نەریتی کەرنەڤاڵی دەدۆزێتەوە کە پێش لە هەموو شتێك، کەسایەتییە دەسەڵاتدارەکان دەخاتە بەر هێرش و ڕەخنەگرتن و هەموو بیروباوەڕە فەرمییەکانی کۆمەڵگا، مێژوو، قەدەر و چارەنووس پووچ و بێبنەما دەزانێ. کەرنەڤاڵ لەگەڵ دەمامك، دێوزمە، جێژن، کایە و درام و جموجۆڵی بەکۆمەڵ لەگەڵ خۆی هەڵگری چەندین پەیامە. مەبەستی سەرەکی کەرنەڤاڵ ڕووخاندن و لەناوبردنی هێژمونی هەرجۆرە ئایدیۆلۆژییەکە کە دەیەوێ سەبارەت بە جیهان قسەی کۆتایی بکات و بە شێوەیەکی

نەگۆڕ، مانایەکی تایبەت بەسەر جیهان و ژیانی مرۆڤەکاندا بسەپێنێ (سەرچاوەی پێشوو، ٢٠٨ - ٢٠٧). باختین لە نێوان سێ جۆری کەرناڤاڵدا جیاوازی دادەنێ:

یەکەم: شانۆی ئایینی Ritual Spectacles، شانۆی کەرناڤاڵی و شانۆی کۆمیکی بازاڕ.

دووهەم: وتاربێژی زارەکی پڕ لە پێکەنین و بزە، شانۆ بە شێوەی زارەکی و نووسراوە.

سێهەم: ژانرە جوراوجۆرە ئەدەبییەکان کە پڕن لە جنێودان، پێکەنین، تیتاڵی، هەڵکزاندن، سووکایەتیکردن بە شتە پیرۆزەکان.

باختین لەسەر ئەو باوەڕەیە کە یەکێك لە سەرەکیترین تایبەتمەندییەکانی کەرناڤاڵ، فاکتەری ئاڵوگۆڕکەر و دژەپێکهاتەبوونیەتی کە دەیهەوێ هەلومەرجی داسەپاو بەلاوە بنێ و لە هەوڵی درووستکردنی هەلومەرجێکی دڵخوازدایە. باختین پێیوایە جۆرێك ناکۆکی و ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان کولتووری رەشۆکی (نافەرمی) و کولتووری فەرمی لە ئارادایە، واتە شەڕێکی قووڵ لە نێوان هێزی کۆمەڵایەتی - کولتووری فەرمی و نافەرمی لە ئارادایە. بەو مانایە کە هێزی کۆمەڵایەتی - کولتووری فەرمی پاوانخوازانە و نادیموکراتیکە، لە حاڵێکدا هێزە نافەرمییەکان لەسەر بنەمای وتووێژ دامەزراوە، هەربۆیە دەتوانین بڵێین تا رادەیەکی زۆر دیموکراتیکن (سەرچاوەی پێشوو: ٢٠٨).

بەبڕوای باختین «کلتوور» چەمکێکی سیاسییە و شێوەی پەیوەندی مرۆڤەکان لەگەڵ یەك دیاردەییەکی کولتووری - سیاسییە. باختین پێی وایە کولتووری کەرنەڤاڵ نیشاندەری ئازادی لە هەلومەرجی کۆمەڵگایەکی داخراوە و دیموکراسی لە شوێنێکدا سەرهەڵدەدا کە ئازادی، بەرابەری و بەشدرای ئازادانە هەبێت. چونکە لە هەلومەرجی داخراودا، دەسەلاتی فەرمی خۆی دەسەپێنێ و لە بەرانبەردا بەربەرەکانێ درووست دەبێ. هەربۆیە کولتووری نافەرمی بە کولتووری بەربەرەکانێ و بەرخۆدان دەزانێ. هەر بەپێی ئەو خوێندنەوەیە، رۆمانەکانی داستایۆفسکی بە رۆمانگەلێك دەزانێ کە لەسەر ئەساس و بنەمای دیالۆگ و وتووێژ دامەزراوە و لە بەرانبەردا رۆمانەکانی تۆلستۆی بە مۆنۆلۆگ و پاوانخوازانە دەزانێ.

لە کۆتاییدا باختین لەسەر ئەو باوەڕەیە کە کولتووری نافەرمی بە شێوەیەکی ئازادانە، پڕ لە پێکەنین و بزە، پڕمانا، سووکایەتی بە شتە پیرۆزەکان، خراپەبێژی، کردەوەی خراپ و لەناوبردنی مەودای نێوان مرۆڤەکانە. هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیە کە پانتایی و ناوەڕۆکی کولتووری نافەرمی نیشاندەری کرانەوە و هەروەها داخراوەیی و ویژدانی بەکۆمەڵی خەڵکە (تۆدۆرۆڤ، ١٥٣-١٥٢).

لەسەر ئەساس و بنەمای ئەو شتانەی کە باختین باسی لێکردووە و بە تایبەت لەسەر سێ جۆری جیاواز لە دەربڕینی کەرنەڤاڵ و لە هەمانکاتدا تایبەتمەندی کولتووری فەرمی (پاوانخواز) و لە

بەرانبەردا کولتووری نافەرمی دژەپاواخوازی (کولتوورێك لەسەر بنەمای دیالۆگ و وتوویێژ)، دەتوانین بڵێین کە فۆلکلۆر بەگشتی و پەند و قسەی پێشینیان دەکەوێتە خانەی سێهەمین شێوەی دەربڕینی کەرنەڤاڵەوە. بە پێی ئەم لێکدانەوەیە دەتوانین پەند و قسەی نەستەق وەکوو ژانرێکی ئەدەبی و زمانی چاو لێبکەین کە خاوەنی هەندێك لەو تایبەتمەندییانە کە بۆ کولتووری «رەشۆکی/نافەرمی» باسمان کرد، واتە تێکەڵێکە لە شتی پیرۆز و ناپیرۆز، پێکەنین، تۆمەت، جنێو، سێکس، هێرشکردنە سەر کەسایەتییە دەسەڵاتدارەکان و هەندێ شتی دیکە لەم بابەتەیە و بۆ سەلماندنی ئەم قسانە لە خوارەوە ئاماژە بەچەندین نموونە دەکەین.

هەزار قول وەڵا، مشتێ بەز ناهێنێت ـ تەڵاق پیاو لە لایەك، تڕ بزن لەلایەك ـ سەد گوناح و یەك تۆبە ـ ئاغەڕۆ خوا شوکر ـ داری تەڕ وە قن قازی ـ هیوا دارایی پیاوی فەقیرە ـ مەلا لە ژێرەوە کار خۆی ئەکا ـ پووڵ بدە مەلا وەك لۆتی سەما ئەکا ـ عەداڵەت باشترە لە عیبادەت ـ ئەگەر وە ریش وێت، بزن سۆفیە ـ وەجوانی خۆی شێخ ئەواتە مەیخانە ـ قورئان ئەفرۆشرێ بۆ نان ـ قورئانم سووتانوێ.

بەڵام لەم باسەی ئێمەدا جۆرێك لە پاڕادۆکس و ناکۆکی بەدی دەکرێ، واتە لە لایەکەوە ئەم قسانە راستی و درووستی تیۆری باختین دەسەلمێنێ و لە لایەکی دیکەوە تیۆری باختین رەت دەکاتەوە. بابەتێك کە دەکرێ وەکوو رەخنە ئاراستەی تیۆری کەرنەڤاڵی باختین بکرێ، واتە ئەگەرچی فەزای گشتی یان کولتووری رەشۆکی بەرهەمی هەموو کۆمەڵە و ئەوانەی بەهۆی هێژمونی کولتووری فەرمی کەوتوونەتە پەراوێزەوە دەتوانن لەم فەزایەدا ئازادانە دەنگ هەڵبڕن و قسەی خۆیان بکەن و ویست و حەز و خولیای خۆیان بخەنە بەرباس و بە گوتەی باختین لەم فەزایەدا سنوورەکانی نێوان مرۆڤەکان ئەپسێ و کاڵ دەبێتەوە و دەتوانین بڵێین ئەم دەرئەنجامە لە خۆیدا شتێکی دێموکراتیکە، چونکە دێموکراسی بە مانایەك لێك نزیکبوونەوەی مرۆڤەکان و بەشداری ئازادانە لە کۆمەڵگادایە و لە هەمانکاتدا جورێك بەربەرەکانێی کولتووری لە بەرانبەری کولتووری فەرمی و زاڵدا درووست دەبێ، واتە وەکوو ئەڵتەرناتیڤێك بۆ ژیان بەئەژمار دێت کە مرۆڤەکان بە ئاسانی و ئازادانە هەناسەی تێدا هەڵدەمژن. بەڵام لە بەرانبەردا ئەو تایبەتمەندییە کە باختین بۆ کولتووری رەشۆکی و نافەرمی وەك درووستبوون لەسەر ئەساسی دیالۆگ و وتوویێژ لە بەرچاو دەگرێ، بە هۆی زاڵبوونی پیاومەزنی بەسەر کولتووری کوردیدا و رەنگدانەوەی ئەم بابەتە لە فۆلکلۆر و پەند و قسەی پێشینیاندا، ئێمە دەنگی ژنان نابیسین و بە تەنیا دەنگی پیاوانە کە لە مەیداندایە و ژنان لە پەراوێزی پەند و قسەی پێشینیاندان. بە چاوخشاندنێك لە ناوەڕۆکی ئەم

پەندانە بۆمان دەردەکەوێ کە زمانی کوردی لە بواری پەند و قسەی پێشینیاندا، هەر وەکوو کاک ئەمیر حەسەنپوور دەڵێ، زمانێکی بێلایەن نییە و پڕە لە هێمای توند و تیژی دژ بە ژنان کە دەبێتە هۆی دووبارەبوونەوەی دەسەڵاتی پیاوسەزنی لە ژیانی ڕۆژانەدا. شتێك کە لە بنەڕەتدا نادێموکراتیکە، واتە مافی نیوەی حەشیمەتی کۆمەڵگا لە بەرچاو ناگیردرێ. بابەتێك کە پێموایە باختین لە سەردەمی خۆیدا لە بەرچاوی نەگرتووە، یان ئەوەی کە ئەو کێشەیە لە سەردەمی ئەودا نەبینراوە.

ئەگەرچی باختین لە نووسراوەکانیدا بە جۆرێك کولتوور دەبەستێتەوە بە سیاسەت و پێی وایە چۆنیەتی هەڵسوکەوت و پەیوەندی مرۆڤەکان لە نێوان ژانرە ئەدەبییەکاندا بۆ خۆی بابەتێکی سیاسییە و پێی وایە کە فەزای نافەرمی، فەزایەکی دێموکراتیکە، چونکە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان لەسەر ئەساسی ئازادی، بەرابەری و بەشداری ئازادە، بەڵام بە وردبوونە و لە هەمانکاتدا لێکدانەوەی ئەم پەند و قسانە بۆمان دەردەکەوێ کە فەزای پەند و قسەی پێشینیان و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ژنان لەگەڵ پیاوان یەکسان و ئازاد و بەرابەر نییە. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە لە خوارەوە چەندین نموونە دەخەینە بەرباس:

ژن و بزن وەنە یەك، دایە تەقەی شاخیان دێت ـ نە بە سوێند ژن باوەڕ بکە، نە بە پێکەنین حاکم ـ ژن بیر ناکاتەوە، مەگەر لەبەر ئاوێنە ـ قوڕە ڕەشە وەبان سەر ئەو کەسە کە ڕاز دڵ خۆی وەلای ژنەوە باس ئەکات ـ ژن تەلاق دریاو، وەسە گای شاخ شکیاو ـ مانگا ئەوەسیەتەوە، کەڵەگا نابەسیەتەوە ـ نە ژن لە زەماوەندا هەڵبژێرە، نە نێرەکەر لە بەهارا ـ هەر کۆچێ مانگا بەرکۆچی وێت، وەقوڕا ئەچێ ـ هەرکەس باوەڕ کا وە باوەڕی ژن، ماڵەکەی وێران وەك ماڵەکەی من ـ ژن قژی درێژە و عەقڵی کورت ـ شەرت بێ بە شەرتی پیاوان ـ خەو ژن چەپە ـ ژن تا نەزێ بێگانەس ـ دانەیەك ژن کەمە، دووان خەمە، سیانی خاترجەمە ـ ئاو بوێسێ وە بێژنگەوە، قسە ناوێسێ وەدەم ژنەوە ـ کەنیشك عازەو وەسە پێسەی سیراج، لە خوارەوە داینێی سەگ ئەیوات، لە ژوور ماڵەوە بێت بۆ دەکا و ...

### جۆرج زیمێل[١] (١٩١٨ - ١٨٥٨)

یەکێکی دیکە لەو کەسانەی کە سەبارەت بە کولتوور و بە تایبەت سەردەمی مۆدێرن نووسراوەی زۆری هەیە و تا ڕادەیەك دەتوانێ یارمەتیدەری ئەم باسەی ئێمە بێت، جۆرج زیمێل

---

١. Georg Simmel

کۆمەڵناسی بەناوبانگی ئەڵمانییە. ئەگەرچی کۆمەڵناسان، زیمێل وەکوو کۆمەڵناس دەناسن، بەڵام ناوبراو حەزی لێیە کە بە فەیلەسووف بناسرێ و لە نامەیەکدا ئاماژە بەوە دەکا کە لە دەرەوەی ئەڵمان من وەکوو کۆمەڵناس دەناسن، ئەگەرچی من خۆم بە فەیلەسووف دەزانم و لە پەراوێزی فەلسەفەدا خەریکی کاری کۆمەڵناسی دەبم (واندنبرگ، ١٣٨٦: ٥). زیمێل لە تەواوی مێژووی ژیانیدا لە دەرەوەی زانستگا مایەوە، رەنگە جوولەکەبوون یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی بووبێت.

زیمێل یەکێك لەو بیرمەندانەیە کە خۆی بە بوارێکی تایبەت نەبەستووەتەوە و پێی وایە دەبێ لەو جۆرە هزر و ئەندێشە دوور بکەوینەوە و لەگەڵ ئەو بیرمەندانە لە دژایەتیدا بوو کە دەیانەوێ بە چەمکێکی تایبەت هەموو جیهان شرۆڤە بکەن. چونکە پێی وابوو جیهانێك بەم هەموو رەهەندە جۆراوجۆرەوە ناکرێ بە چەمکێکی تایبەت لێکبدرێتەوە. رەنگە یەکێك لەو هۆکارانە کە بووەتە هۆی ئەوەی کە زیمێل نووسراوەی جۆراوجۆری هەبێت هەر لە سۆنگەی ئەم بیروبۆچوونەوە سەرچاوە دەگرێ و یەکێك لەو تەوەرانە کە پێوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە **«فەلسەفەی کولتوور و ژیانخوازیە»** کە زیمێل بە خەستوخۆڵی باسی لێکردووە.

زیمێل لە وتارێکدا بە ناوی **«دژایەتی و ناکۆکی کولتووری مۆدێرن»** لەژێر کاریگەری بیر و ئەندێشەی نیچە، شۆپێنهاوێر و کانتدا دەڵێ: لەو کاتەوە کە ژیان لە ئاستی بایۆلۆژی دەست پێدەکا و بە ئاستی مێشك دەگات، واتە مێشك هێدیهێدی گەشە دەسێنێ و دەچێتە پێشێ، لە ئاکامدا کولتوور درووست دەبێ و دژایەتی و ناکۆکی ناوخۆیی سەرهەڵدەدا. زیمێل پێیوایە کە گۆڕان و پێشکەوتنی کولتوور، پێکهاتووە لە گەشە و وەلاوەنان و سەرهەڵدانی سەرلەنوێی ئەم ناکۆکی و دژایەتییە و کولتوور لە تەواوەتی خۆیدا بەرهەمی ئەم گۆڕان و پێشکەوتنەیە (زیمێل، ١٣٨٠: ٢٢٥).

دوو چەمکی زۆر گرنگ کە زیمێل بۆ نیشاندان و لەقاودانی ئەم ناکۆکی و دژایەتییە کەڵکی لێ وەردەگرێ، چەمکی **ژیان** و **فۆڕم** (Form)ە. مەبەستی زیمێل لە چەمکی ژیان ئەو رەوتە دینامیکییە کە بێوچان لە حاڵی جموجۆڵ و نەوەستانە و لە رەوتی ئەم گۆڕانەدا هەندێ فۆڕم دادەهێنێ کە نیشانەی داهێنەری و دینامیکبوونی ژیانە و لە هەمانکاتدا، ئەو فۆڕمانە بە ژیان مانا دەبەخشن. ئەم رەوتە لە فەلسەفەدا بە فەلسەفەی ژیان ناسراوە. مەبەستی زیمێل لە فۆڕم، ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بە ژیان مانا دەبەخشن، وەکوو یاسا، داب و نەریت، بەرهەمی هونەری و ئەدەبی، زانست، تەکنۆلۆژیا، ئایین، شێوەی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری و هەزاران شتی دیکە کە لە رەوتی ژیاندا دروست دەبن. لە روانگەی زیمێلەوە ئەم فۆڕمانە لە سەردەمی رابردوودا، لەوکاتەدا کە مرۆڤ دایهێناوە، واتە لە کات و ساتی داهێنانیدا لەگەڵ رەوتی ژیان لە دژایەتیدا نەبووە، بەڵکوو

پڕ بە پێستی ژیان بووە. بەڵام دواتر ئەم ناکۆکی و دژایەتییە درووست دەبێت، چونکە ژیان لە گۆڕاندایە، لە بەرانبەردا چەمکی فۆڕم شێوەیەکی نەگۆڕ بەخۆی دەگرێ و ئیدیعای ئەوە دەکا کە دەتوانێ بۆ هەمووکات و ساتەکان وڵامدەر بێت. لە ئاکامدا دیاردەیەك سەرهەڵئەدا کە زیمێل بە ناکۆکی و دژایەتی یان بە وتەیەکی دیکە نەخۆشی کولتووری ناوی لێدەبا و لە ئاکامدا کلتوور دەبێتە دوژمنی ژیان (سەرچاوەی پێشوو).

لە روانگەی زیمێلەوە، مێژوو لە تەواوەتی خۆیدا شتێك نییە بێجگە لە گۆڕانی ئەم فۆڕمانە و لە هەمانکاتدا زیمێل پێی وایە کە رەوتی ژیان ناناسرێ و هەمووکات بە نەناسراوی[1] دەمێنیتەوە. بەڵام ئەوە فۆڕمە کە مرۆڤ دەتوانێ بیناسێ و لێکدانەوە و پێناسەی بکات و ئەرکی فەیلەسووف و کۆمەڵناس، ناسینی ئەم فۆڕمانەیە.

زیمێل لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ژیان لە دەرەئەنجامی ئەو گۆڕانە، هەندێك فۆڕمی تایبەت بەخۆی دەگرێ، هەر بۆیە دەبێ کولتووری کۆن، جێگەی خۆی بدا بە کولتووری نوێ. بە باوەڕی زیمێل ئەم گۆڕانە هەموو رەهەندەکانی ژیان واتە بواری ئابووری، سیاسەت، ئەدەب، زانست و ئایین دەگرێتەوە.

بابەتێك کە لە لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبدەین و بەلای زیمێلەوە زۆر گرنگە و جەختی لەسەر کردووەتەوە، ئەوەیە کە لە هەر سەردەمێکی مێژووییدا، بیر و ئایدیایەکی بنەڕەتی بەسەر ئەو سەردەمەدا زاڵە و رێکخەر و مانابەخشی پێوەندی نێوان ژیان و فۆڕمە. ئەم بیروبۆچوونە زاڵە، رۆڵی رێنوێنیکەری ئامانجە سەرەکییەکانی ژیانی هەیە. بۆ وێنە بیری زاڵ لە سەردەمی یۆنانی کۆندا **«بوون»** لە سەدەکانی ناوەڕاست **«خودا»** لە سەردەمی رێنسانس **«سرووشت»** لە سەدەی حەفدەهەم بەو لاوە **«یاسای سرووشت»**ە. بەڵام زیمێل پێیوایە کە بیری زاڵ لە سەردەمی مۆدێرندا **«نەبوونی فۆڕم»**ە، واتە سەردەمی مۆدێرن نایەوێ بچێتە ناو هیچ فۆڕمێکی تایبەتەوە و نهێنی دژایەتی کولتووری مۆدێرن هەر لێرەدایە کە وەکوو کولتووری رابردوو، نایەوێ بچێتە ناو فۆڕمێکی تایبەتەوە و لە هەرجۆرە فۆڕمێك کە بیەوێ لە قاڵبی بدات و سنوورداری بکات خۆ لادەدا، بەڵام حەزی ژیان بۆ مانابەخشین بە خۆی ناچارە لە فۆڕمگەلێکدا خۆی پێناسە بکات (سەرچاوەی پێشوو: ٢٤٩).

ئەگەر لەسەر ئەساسی ئەو بیروبۆچوونانەی زیمێل، بمانەوێ بابەتی ئەم لێکۆڵینەوە لێکبدەینەوە، دەتوانین بڵێین رەوتی ژیان لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، وەکوو هەر کۆمەڵگایەکی دیکەی ئەم جیهانە، هەندێك فۆڕمی تایبەت بەخۆی بەرهەم هێناوە کە ئەمرۆ بەگشتی وەکوو کولتوور ناوی

---

[1] ـ چەمکی «ژیان» کە لێرەدا زۆر جەختی لەسەر کراوەتەوە تا رادەیەکی زۆر ناڕوون و لێڵە.

لێدەبەین. پەندی پێشینیان، مەتەڵ و قسەی نەستەق وەکوو بەشێکی ئەم کولتوورە، ویستوویەتی بە ژیانی مرۆڤی کورد مانا ببەخشێ و ڕەنگدانەوەی ڕەوتی ژیانی کۆمەڵگای کوردییە. هەروەها کە زیمێل باسی لێدەکا لە رابردوودا ئەم شتانە لەگەڵ ڕەوتی ژیانی کۆمەڵگای کوردیدا ناکۆکی و دژایەتی نەبووە، بەڵکوو بە گۆڕانی کۆمەڵگای کوردی، ئەم گرفتە سەری هەڵداوە. بابەتێکی زۆر گرنگ کە دەبێ جەختی لەسەر بکەینەوە و تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندی بە پرسیاری سەرەکی ئەم باسەوە هەیە، ئەوەیە ئەم فۆڕمانە تا چ ڕادەیەك دەتوانن وڵامدەری کۆمەڵگای ئەمڕۆی ئێمە بن؟ ئەگەرچی پێم وانییە کە کۆمەڵگای ئێمە، کۆمەڵگایەکی بە تەواوەتی مۆدێڕنە، کەوابوو دەبێ فۆڕمێکی مۆدێڕنی هەبێت. بەڵام پێموایە کۆمەڵگای ئێمەش وەکوو هەموو کۆمەڵگایەکی دیکەی ئەم جیهانە بە هۆی هەندێ ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لەسەر ئاستی جیهانی و دیاردەی بەجیهانیبوون تا ڕادەیەکی زۆر گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئێستا پرسیار ئەوەیە: ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بە گشتی و پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان بە تایبەتی تا چەندە لەگەڵ بەها و ئەرزشەکانی سەردەمی مۆدێڕن و هەروەها دێمۆکراسی وەکوو گوتاری زاڵی ئەم سەردەمە یەك دەگرێتەوە؟

ئەگەر بە کورتی چاوێك لە مێژووی سەردەمی مۆدێڕنیتە لە ئەورووپا بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە سەرەکیترین فاکتەری هاندەری مۆدێڕنیتە، سەروەری عەقڵ، عەقڵی ڕەخنەگرانە، ئازادی، بەرابەری، بەشداری ئازادانە، باوەڕ بە پێشکەوتن، مافی بەرابەر بۆ ژن و پیاو و چەندین شتی دیکەی لەم بابەتە لەخۆ دەگرێ. لێرەدا بۆ وڵامدانەوە بەو پرسیارەی سەرەوە و ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم تەوەرە، ناچارین چاوێك بەم پەند و قسانەدا بخشێنین و چەندین نموونە بخەینە بەر باس.

ئەگەر لە سەرەکیترین پرۆژەی زاڵ بەسەر مۆدێڕنیتەدا، واتە سەروەری عەقڵ دەست پێبکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە لەم پەند و قسانەدا بەهایەکی زۆر بە عەقڵ دراوە و هەمووکات عەقڵ وەکوو فاکتەرێکی گرنگ جەختی لەسەر کراوەتەوە کە لە ژێرەوە ئاماژە بە چەندین نموونە دەکەین: دوژمنی عاقڵ لە دۆستی گەوج باشترە، گلەیی لە گەوج ناکرێ، هاتنە ماڵ بە لیباسە، ڕۆیشتن بە عەقڵە، گەورەیی بە عەقڵە نە بە ساڵ، یاخوا دۆس ژنەکەیشت عاقڵ وێت، عەقڵ لە جوانخاسی چاکترە، عاقڵ دووجار ناخەڵەتێ، سەری پیاوی عاقڵ هیچ کات نایشێ، عەقڵ سووك باری قورسە، گەوج نووشتەی نییە، شێت هەیەسی.

بە چاولێکردن لەم پەند و قسانە بۆمان دەردەکەوێ کە بایەخێکی زۆر بە عەقڵ دراوە، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا ئەم عەقڵە هەر هەمان ئەو عەقڵەیە کە بە سەر پرۆژەی مۆدێڕنیتەدا زاڵە؟ ئایا ئەم عەقڵە عەقڵێکی ڕەخنەگرانەیە کە هەموو شتێك دەخاتە ژێر پرسیارەوە؟ بە لێکدانەوەی

ناوەرۆکی ئەم پەندانە بۆمان روون دەبێتەوە کە عەقڵی زاڵ بەسەر کولتووری کوریدا، بە گشتی عەقڵێکی جیاوازە لە عەقڵی سەردەمی مۆدێرن، واتە عەقڵی زاڵ بە سەر کولتووری کوردیدا عەقڵێکە لەژێر کاریگەری و ئۆتۆریتەی ئایین و نەریتدایە. هەر ئەو شتەی کە بە زۆری رەنگە هەموومان بە شێوەیەك بیستوومانە کە دەڵێن: هەرچی شەرعی بێت عەقلییە، بەڵام هەرچی عەقڵی بێت شەرعی نییە.

بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم وتانە بە پێویست دەزانم سەبارەت بەم بابەتە ئاماژە بە وتەی بیرمەندی گەورەی کورد، عەباس وەلی بکەم کە پێیوایە لە نێوان عەقڵی فەلسەفی و عەقڵی سەردەمی مۆدێرندا جیاوزای هەیە. ناوبراو لەسەر ئەو باوەڕەیە عەقڵی فەلسەفی زۆر کۆنترە لە مۆدێرنیتە و بە رەچەڵەك بۆ سەردەمی رۆم و یۆنانی کۆن دەگەڕێتەوە. بە بۆچوونی ناوبراو جیاوازی سەرەکی عەقڵی فەلسەفی لەگەڵ عەقڵی مۆدێرن، لەوەدایە کە عەقڵی مۆدێرن پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ مەسەلەی ئازادی هەیە، بەڵام عەقڵی فەلسەفی هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی ئازادی و چەمکی ئازادییەوە نییە و لەژێر ئۆتۆریتەی دەرەوەی خۆی، واتە ئایین و نەریتدایە. بەڵام مۆدێرنیتە گرنگی بە سەروەری عەقڵ دەدات و دژایەتی لەگەڵ هەرجۆرە غایەتێکی ئایینی دەکات کە لە دەرەوەی سنووری عەقڵە (وەلی، ٢٠٠٥: ٢٠٦- ٢٠٥). بە پێی ئەم خوێندنەوەیە دەتوانین بڵێین عەقڵی زاڵ بەسەر پەند و قسەی پێشینیاندا عەقڵێکی فەلسەفییە، هەر بۆیە نەیتوانیوە ببێتە فاکتەرێکی پاڵنەر بۆ گۆڕان و دەبینین ساڵەهایە هەموو شتێك هەر وەکوو خۆی وایە، و هیچ شتێك ناگۆڕدرێ.

فاکتەرێکی دیکەی مۆدێرنیتە کە زۆر گرنگی هەیە ئازادی و بەرابەرییە، واتە ئازادی، مافی تاك و بەرابەری هەموو مرۆڤەکان. هەروەها کە پێشتر باسم کرد و چەندین نموونەم خستە بەرباس ئەو پەند و قسانە لەژێر کاریگەری گوتاری پیاوەمزنیدان و تا سەر ئێسقان دژی ژنن و ژنان لە سەرەتاییترین ماف بێبەشن. هەر بۆیە سەبارەت بە ئازادی و مافی تاك دەتوانین بڵێین کۆمەڵگای ئێمەش، وەکوو هەر کۆمەڵگایەکی نەریتی دیکە، کۆمەڵگایەکە کە لەسەر وێکچوون درووستبووە و ئەگەر کەسێك وەکوو کۆمەڵ نەبێت پێیان وایە دژەکۆمەڵە و لە هەمانکاتدا وەك شێت و لاسار چاوی لێدەکەن و هیچ تاکێك بە شوناسی تایبەت بە خۆیەوە قەبووڵ ناکرێت. هەر بۆیە دەتوانین بڵێین لە وەها هەلومەرجێکدا ئازادی، بەرابەری و مافی تاك هیچ مانایەکی نییە.

فاکتەرێکی دیکەی مۆدێرنیتە باوەڕ بە پێشکەوتنە کە هێزی مرۆڤ لە پشتی ئەم پێشکەوتنەدا ئامادەیە. ئەگەرچی لە کولتووری کوردیدا باوەڕ بە پێشکەوتن هەیە، بەڵام دەستی مرۆڤ لە پشتی ئەم پێشکەوتنەدا ئامادە نییە. بۆ سەلماندنی ئەم قسانە ئاماژە بە چەندین نموونە دەکەین: تەرەقی و

تەنزووڵ بە دەست خودایە ـ ئەگەر خودا مەیلی بێت، شەوی تاریک دەکا بە ڕۆژی ڕووناك ـ بێ ڕەزای خوا، گەڵا لە دار ناکەوێتە خوار ـ خاس و خراو بە دەس خواس ـ خوا بیا ناپرسێ، نەیشیا ناترسێ.
واتە مرۆڤی کورد باوەڕی بە پێشکەوتن و گۆڕان هەیە، بەڵام بۆ خۆی فاکتەری هاندەری پێشکەوتن و گۆڕان نییە، بە پێچەوانە لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا وەکوو نیچە دەڵێ: مرۆڤ بۆ خۆی هونەرمەند و داهێنەری ژیانە و چاوەڕوانی ئەوە نییە لە دەرەوەی دەسەڵات و توانای خۆی کارێك بچێتە پێش.
لە کۆتاییدا بە پشتبەستن بە ناوەرۆکی ئەم پەند و قسانە و لەژێر ڕۆشنایی بۆچوونی زیمێلدا، دەتوانین بڵێین ئەم فۆڕمانە (پەند و قسەی پێشینیان) لەگەڵ ڕەوتی ژیانی ئێستای کۆمەڵگای کوردیدا، یەك ناگرێتەوە، بەڵام ئەمە بەو مانا نییە کە هەموو ئەو شتانەی کە هەمانە بیخەینە لاوە یان وەك دەڵێن لە نووکەوە دەست پێبکەین، بەڵکوو پێویستمان بە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانە لە رابردوو هەیە کە بتوانین لایەنە لاواز و خراپەکانی وەلا بنێین و لە هەمانکاتدا لایەنە باشەکانی بەهێز و بەرۆژتر بکەین. ئەگەر چاوێك لە ڕەوتی مۆدێرنیتە لە ڕۆژئاوا بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆژئاواییەکان بەگشتی کولتووری خۆیان نەخستە پەراوێزەوە، بەڵکوو ڕابردووی خۆیان بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە هەڵسەنگاند و بە شێوەیەکی عەقڵانی لە نەریت دابڕان تاکوو بە ئەمڕۆ گەیشتن.

* * *

## میتۆدی لێکۆڵینەوە

ئەم کتێبە لە کۆمەڵێك پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان پێکهاتووە، کە بە شێوەی کاری مەیدانی ئامادە کراوە و بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانی ماوەی نزیك بە دوازدە ساڵ مامۆستاییمە، واتە لە ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی تا ١٣٩٠. لێرەدا پێویستە ئاماژە بکرێ کە ئەم کۆمەڵە پەند و قسانە لە سەقز و ناوچەکانی تیلەکۆ، سوننەتە، خوڕخوڕە، کوڵتەپە و ساحێو کۆکراوەتەوە.
ئەم کۆمەڵە پەند و قسانە بە شێوازی وتووێژ[1] کۆکراوەتەوە. بەشێکی بۆ خۆم ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵك و بەشێکی زۆری دیکەی بە یارمەتی قوتابیانی خۆشەویست لەو ناوچانەی کە باسم کرد کۆکراوەتەوە. دواتر بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان لە تەکنیکی پێداچوونەوەی زەین Check Memory کەڵکم وەرگرتووە، واتە بۆ جاری دووهەم لە لایەن کەسانێکەوە کە سەبارەت بە ئەدەبی فۆلکلۆر شارەزاییان هەبووە، ئەو هەڵە و چەوتییانە ڕاست کراوەتەوە.
لە کۆتاییدا ئەم بەشەدا بە پێویست دەزانم ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەم، واتە تەواوی ئەو

---

١. Interviwe

شتانەی کە لەم وتارەدا دەگوترێ بە دیاریکراوی لەسەر پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیانە کە لەم کتێبەدا هاتووە و تۆمارکراوە و ناکرێ بۆ بەشەکانی دیکەی فۆلکلۆر یان بۆ ناوچەیەکی دیکەی کوردستان ببێتە بنەمای داوەری و بەگشتی کردن[١].

* * *

## بەربەستەکانی پشکنین و لیکۆڵینەوە

دەتوانین لەمپەر و بەربەستەکانی ئەم لێکۆڵینەوە لە چەند بەشدا پۆلێنبەندی بکەین:

**یەکەم:** کەمبوونی لێکۆڵینەوەی ئاکادێمی و میتۆدیك لە کتێبخانەی کوردیدا سەبارەت بە پەند و مەتەڵ و قسەی پێشینیان.

**دووهەم:** کەمبوونی سەرچاوەی باوەڕپێکراو سەبارەت بە پەند و قسەی پێشینیان و مەتەڵ بە زمانی کوردی.

**سێهەم:** نەبوونی لێکۆڵینەوەی تیۆریك لەسەر فۆلکلۆر بەگشتی و بە تایبەت لەسەر پەند و مەتەڵ و قسەی نەستەق بە زمانی کوردی.

* * *

## دەرئەنجام

بە لێکدانەوەیەکی کورتی ئەم باسە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە تا چەندە فۆلکلۆر بەگشتی و پەند و قسەی نەستەق و مەتەڵ بەتایبەتی، وەکوو بەشێك لە ئەدەبی فۆلکلۆر، گرنگی و بایەخی هەیە. هەروەها تا چەندە وەکوو سەرچاوەیەکی قووڵی زانیاری و زانست و لە هەمانکاتدا وەکوو مەتریاڵێکی خاو بۆ درووستکردن و بنیاتنانەوەی سەرلەنوێی مێژووی کۆمەڵایەتی، کولتووری و ئابووری نەتەوەی کورد کە زۆرترین شتەکانی تاکوو ئێستاش هەر بە شێوەی زارەکین بەنرخ و پڕبەهایە و لە هەمانکاتدا دەتوانین وەکوو فاکتەرێکی بەهێزی شۆناس چاوی لێبکەین کە دەتوانێ ببێتە هۆی لێك نزیککردنەوەی نەتەوەکەمان.

بە پێی ئەم لێکدانەوە کورتە کە لەم پێشەکییەدا خستمانە بەرباس، دەکرێ بە چەند ئاکامی گرنگ و باڵکێش ئاماژە بکەین:

یەکێك لە دەرئەنجامەکانی ئەم لێکدانەوەیە، ئەوەیە کە ئەم پەند و قسانە تا رادەیەکی زۆر لەگەڵ یەك پارادۆکسن و دژایەتییان هەیە، واتە ئەگەرچی لە لایەکەوە وەکوو جۆرێك لە

---

١. Generalization

بەریەرەکانێی کولتووری لە بەرانبەر فەرهەنگی زاڵ و فەرمی بەسەر ئەم ناوچەیەدا دەوەستنەوە و دەبنە ئەڵتەرناتیف بۆ ژیانی فەرمی و لەم هەلومەرجەدا جۆرێك لە فرەدەنگی و فرەڕەنگی پێکدەهێنن کە لە شێوەی خۆیدا بەلای منەوە تا رادەیەکی زۆر دێموکراتیکە و دەتوانێ بە پرۆسەی دێموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا بەگشتی و بواری کولتوور بە تایبەتی یارمەتی بدات و دەنگی پەراوێزخراوەکان بخاتەوە رۆژەڤەوە، واتە کەسانێك کە تاکوو ئێستا دەنگیان نەبیستراوە و ئاوڕیان لێ نەدراوەتەوە. بابەتێك کە ئەمڕۆ هەندێك لە رەخنەگران، وەکوو رەخنەیەك ئاراستەی مۆدێرنیتەی دەکەن، بەڵام لە لایەکی دیکەوە زمان و ناوەرۆکی ئەم پەند و قسانە لەژێر کاریگەری کولتووری باوکمەزنیدا، پڕن لە هێمای توندوتیژی دژ بە ژنان. بە وردبوونەوەی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان لەم نووسراوانەدا، بۆمان دەردەکەوێ کە پەیوەندییەکی نابەرابەر، پاوانخوازانە و نادێموکراتیك لە نێوانیاندا لە ئارادایە و ئەگەر لەم بارەوە هەوڵێك نەدرێ دەتوانێ ئەم رەوتە لە کولتوورەوە بگوازرێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگا بەگشتی، واتە گواستنەوەی کولتووری نادێموکراتیك لە تێکستەوە بۆ کۆمەڵگا. لێرەدایە کە گرنگی و بایەخی رەخنەگرتن بۆ ئێمە زۆرتر دەردەکەوێ و ئێمە بەو قەناعەتە دەگەیەنێ کە نابێ لەوە بترسین کە رابردووی خۆمان بە روانگەیەکی رەخنەگرانەوە بخوێنینەوە یان بۆ دەربازبوونی کاتی لەم بارودۆخە، هەموو کەموکووڕییەکانی خۆمان بخەینە پاڵ ئەوانی دیکە. بابەتێك کە ئەمڕۆ زۆربەی بیرمەندان لەژێر ناوی تیۆری «پیلان» دەیخەنە بەرباس و لە وڵاتانی رۆژهەڵاتدا برەوێکی زۆری هەیە. مەبەستم ئەوەیە کە بۆ بنیاتنانی داهاتوویەکی بەهێز و بەختەوەر، پێویستمان بە خوێندنەوەیەکی عەقڵانی بەستێنی کۆمەڵایەتی خۆمان هەیە، تاکوو بتوانین بەدوور لە هەرجۆرە لاساییکردنەوەیەکی وڵاتانی دیکە بەرەوپێشەوە بچین. چونکە پێموایە هەر وڵاتێك لەم دونیادا بە هۆی هەلومەرجی تایبەت بە خۆیەوە دەتوانێ بە شێوەی تایبەت بە خۆی گەشە بسەنێت و پێش بکەوێ. بۆ وێنە وڵاتی ژاپۆن یەکێك لەو وڵاتانەیە کە بە پشتبەستن بە داب و نەریتی خۆیان، ئەمڕۆ یەکێك لە بەهێزترین وڵاتانی جیهانە.

دەرئەنجامێکی دیکەی ئەم لێکدانەوەیە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە لە باری تیۆرییەوە یەك تیۆری ناتوانێ بەگشتی ئەم تەوەرە لێکبداتەوە. چونکە ئەم بابەتە بۆخوی بابەتێکی ئاڵۆز و فرەڕەهەندە، وەکوو ئەو توێژینەوانەی کە هەندێك لە لێکۆڵەران لە روانگەیەکی تایبەتەوە ئەنجامیانداوە. بۆ وێنە مامۆستا ئەمیر حەسەنپوور یەکێك لەو کەسانەیە کە بە پشتبەستن بە گوتاری و تیۆری زمانناسی رەخنەگرانە پێیوایە زمانی کوردی زمانێکی بێلایەن نییە، واتە پڕ لە توندوتیژی لەدژی ژنانە، کەوابوو کولتووری کوردی، کولتوورێکی نادێموکراتیکە. ئەگەرچی ئەم بۆچوونە تا رادەیەك راست و

لەجێی خۆیدایە، بەڵام پێموایە کولتووری کوردی لایەنی پۆزەتیڤی زۆریشی هەیە کە بە داخەوە مامۆستا حەسەنپوور لە بەرچاوی نەگرتووە (بۆ تێگەیشتنی زۆرتری ئەم بابەتە چاو لە دەرئەنجامی یەکەم بکەن). بەڵکوو پێموایە بۆ لێکدانەوەی ئەم باسە پێویستمان بە کۆیەکی تیۆریك هەیە و لەوەش گرنگتر دەتوانم بڵێم کە رەنگە پێویستمان بە دروستکردن و هەڵێنجانی تیۆری لەسەر واقێعی کۆمەڵگای خۆمان هەبێت، واتە لەسەر واقیعی کۆمەڵگای خۆمان تیۆری دروست بکەین، نە ئەوەی کە تیۆری بیانی بەسەر واقیعی کۆمەڵگادا بسەپێنین کە دەتوانێ ئاسەواری خراپی لێبکەوێتەوە.

تەوەرێکی دیکە کە لە ئاکامی ئەم لێکۆڵینەوەدا زۆر بەرچاوە ئەوەیە کە ناوەرۆکی ئەم پەند و قسانە بایەخێکی زۆریان بە بواری کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگای کوردی داوە، بەڵام رەنگدانەوەی بواری سیاسەت بەگشتی زۆر بەرچاو نییە، بابەتێك کە تا رادەیەکی زۆر لە بۆچوونی ئەو کەسانەوە نزیکە کە پێیانوایە ناسیۆنالیزم وەکوو ئەندێشە لە کولتوور و کۆمەڵگای کورددا بوونی نییە.

وەکوو ئاکامی دوایی ئەم لێکۆڵینەوە دەتوانین بڵێین پەند و قسەی پێشینیان دەتوانێ یارمەتیدەرێکی باش بن بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی. چونکە زمانی فۆلکلۆر بە گشتی بەهۆی شکاندنی هەندێ تابۆ و حەرامەوە زۆر دەوڵەمەندترە لە زمانی فەرمی.

لە کۆتاییدا وەکوو پێشنیارێك حەز دەکەم ئەوە بڵێم کە نەوەی نوێ و بەتایبەت خوێندەواران هەوڵ بدەن بە خێرایی ئەم سامانە کولتووری و کۆمەڵایەتییە کە گەنجینەیەکی پڕبایەخە، کۆ بکەنەوە، چونکە لە کیسچوون و فەوتانی خەسارێکی قەرەبوو نەکراوەیە. گەنجینەیەك بە شتە جوان و ناشیرینەکانیەوە کە رەنگە هەندێ کەس بە تەنیا شتە جوانەکانی زەق بکەنەوە، بەڵام بەلای منەوە شتە ناحەزەکانیش جوانن، چونکە پرسیار دروست دەکەن. هەروەها ئەگەر کرا ئەم پەند و قسانە وەرگێڕن بۆ سەر زمانەکانی دیکەی دونیا و ببنە هۆی ناساندنی زیاتری نەتەوەکەمان. پەند و قسەگەلێك کە پێموایە لە شێوەی خۆیدا هیچ لەو پەند و قسانەی نەتەوەکانی دیکەی دونیا کەمتر نین.

لە کۆتاییدا بە پێویست دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم دەربڕم لە هەمبەر تەواوی ئەو کەسانەی کە لە بەدیهاتن و بە ئەنجامگەیشتنی ئەم کارەدا، پاڵنەر و یارمەتیدەر بوون. بە تایبەت ئەو قوتابییە خۆشەویستانەی لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا لە قوتابخانەکانی ئاوایی «سونەتە ـ خوڕخوڕە ـ ساحێو ـ تیلەکۆ ـ کوڵتەپە ـ جونیان» بە دڵێکی کراوەوە یارمەتیدەر بوون و ئەگەر هەوڵ

و تەقەلای ئەو خۆشەویستانە نەبوایە بێگومـان ئـەم کـارە بـە ئـەنجام نەدەگەیشـت. هـەروەها ڕێـز و سوپاس بۆ دۆستانی خۆشەویست، کاك عەباس مورادیان، حسەین محەمەدزادە، خالید عەبـدوڵلاهی، فەتاح خدری و کاوە عەلیزادە بکەم کە بە وردی ئەم نووسراوەیان خوێنـدەوە و هەنـدێ سـەرنج و ڕای پێویستیان سەبارەت بە باشترکردنی ئەم بابەتە دەربڕی. هەروەها کـاك ئومیـد موقـەدەس و دۆسـتی خۆشەویست کاك ئازاد سورخی کە ئەرکی پیتچنین و ڕازاندنەوە و دیزاینی بەرگی ئـەم کتێبـەیان بـە ئەستۆوە بووە و گەلـێ بەم کارەوە زەحمەتیان کێشاوە و ماندوو بوون.

خالید عەلیزادە

## سەرچاوەکان :

**ئا) کوردی :**

- ئەحمەدی، ئیبراهیم، (١٣٨٩)، فەرهەنگی مەتەڵ (چیستان) و لیچار (معما) کوردی، سنە، انتشارات علمی کالج
- ولی، عباس، (٢٠٠٥)، مۆدێرنیتە، پۆست مۆدێرنیتە، ناسیۆنالیزم، دیانەی ئازاد حەسیب قەرەداغی، توێژینەوەی ژمارە ٢

**ب) فارسی :**

- ازکیا، مصطفی، (١٣٧٧)، فرهنگ توسعه در ادبیات کُردی، نشریەی علمی - پژوهشی نامه، علوم اجتماعی، تهران، شماره ١٢
- الیسون، کریستین، (١٣٨٤، فولکلور و فانتزی، ترجمەی: کمال خالق‌پناه، نشریەی اجتماعی - فرهنگی نویسا، تهران، شماره ۴
- انصاری، منصور، (١٣٨۴)، دمکراسی گفتگویی، تهران، نشر مرکز
- پارسا، سیداحمد، (١٣٨٧)، بررسی تطبیقی ضرب‌المثل‌های کُردی و فارسی، سنندج، انتشارات دانشگاه کردستان
- پین، مایکل، (١٣٨٢)، فرهنگ اندیشەی انتقادی، از روشنگری تا پسامدرنیته، ترجمەی: پیام یزدان‌جو، تهران، چاپ سوم، نشر مرکز
- دهخدا، علی‌اکبر (١٣٧۵)، فرهنگ دهخدا، مؤسسەی لغت‌نامەی دهخدا، تهران، چاپ اول، جلد ۶
- تودوروف، تزوتان، (١٣٧٧)، منطق گفتگویی میخائیل باختین، ترجمەی: داریوش کریمی، تهران، نشر مرکز
- حبیبی‌درگاه، بهنام، (١٣٨٨)، حقوق فولکلور (فرهنگ عامه)، تهران، مجمع علمی و فرهنگی مجد
- زیمل، گئورگ، (١٣٨٠)، تضاد فرهنگ مدرن، ترجمەی: هاله لاجوردی، فصلنامەی فلسفی، ادبی، فرهنگی ارغنون، تهران، شماره١٨
- طباطبایی، سیدجواد، (١٣٨٠)، دیباچه‌ای بر نظریەی انحطاط ایران، تهران، نشر نگاه معاصر
- کاظمی، عباس، (١٣٨٧)، مطالعات فرهنگی، مصرف فرهنگی و زندگی روزمره در ایران، تهران: انتشارات جهاد دانشگاهی واحد تهران
- کوزر، لویس، (١٣٧٣)، جامعه‌شناسی معرفت، ترجمەی: سعید سبزیان، نشریەی علمی - پژوهشی نامه، علوم اجتماعی، تهران، شماره ...
- واندنبرگ، فردریک، (١٣٨۶)، جامعه‌شناسی جورج زیمل، ترجمەی: عبدالحسین نیک‌گُهر، تهران، انتشارات توتیا

**ج) ئینگلیزی**

- Amir, Hassanpour , The (re) production of patriarchy in the Kurdis language
- www. Wisegeek.com/what-is- folklore.httm
- www. En.wikipedia.org/wiki/folklore

١. ئۆخەی ئۆخەی، هەرکەس بۆ خۆی.

٢. ئاخ دەردی پیری پەنی وە من دا، پشتم چەفتەو بوو، هەزار قوفڵم دا.

٣. ئاخ لە دەردی برسیەتی، سکم قۆڕەقۆڕیەسی.

٤. ئاخر عومرە و ئەوەڵ ماڵداری.

٥. ئاخر هەر شتێ، تازە ئەوەڵ کارە.

٦. ئاخوڕ خۆی لـێ گۆڕیا.

٧. ئادەمیزاد نە بۆ نۆکەری خولقاوە نە بۆ ئاغایەتی، بەڵکوو بۆ برایەتی خولقاوە.

٨. ئارەزوو بۆ جوان عەیب نییە.

٩. ئاردەکەمان چوو، سۆسەکەمان ماوە.

١٠. ئاردی بن دڕك کۆ نابێتەوە.

١١. ئاسەڕەکەی لە بەرگەکەی زۆرتری تێ ئەچێت.

١٢. ئاسمان بە بێ هەور نابێت، بەنەیش بە بێعەیب نابێت.

١٣. ئاسمان بوێتە لێفە، دای ناپۆشێ.

١٤. ئاسمان کلاوێکە، جێگەی هەموو سەرێك دەبێتەوە.

١٥. ئاسمانە چکۆلە، بەفری لێ ئەبارێت.

١٦. ئاسن بە ژەنگی خۆی نەبێ دانارزێ.

١٧. ئاسن سارد ئەکوتێ.

١٨. ئاسنگەر ئەزانێ لەگەڵ ئاسنگی خۆیا چی بکا.

١٩. ئاسنی سارد بە یەك فوو گەرم نابێتەوە.

٢٠. ئاسیاو ئاو کەفتوو.

٢١. ئاسیاو بە نۆرەس.

٢٢. ئاسیاو گرمەی دێ، بەڵام ئاردی دیار نییە.

٢٣. ئاسیاو کار خۆی دەکا و چەقەنە دەم خۆی ئەشکێنێ.

٢٤. ئاسیاو لە مزین وێت هەر ئەمزێ.

٢٥. ئاسیاو وەنۆرە، ئاردەکەی زۆرە.

٢٦. ئاسیاویی نەهاتووە، هەوڵ ئاشەوانیە.

٢٧. ئاش بە تاڵ، ئاشەوان بەتاڵ.

٢٨. ئاش کەم هاڕ بووە هیچ نەهاڕ نەبووە.

٢٩. ئاش لە خەیاڵێك، ئاشەوان لە خەیاڵێك.

٣٠. ئاشێ شلە وێت، ئاشپەزەکەی خولە وێت، هەرکە بیخوا گول ئەوێت.

٣١. ئاشتی دوژمن، وەکوو شەڕی هاوڕێیە.

٣٢. ئاشێکت بۆ درووس ئەکەم، مەنێ رۆن وەبانیەوە وێت.

٣٣. ئاگر خاسە نەوەك دوو، برا خاسە نەوەك شوو.

٣٤. ئاگر لە خەودا، وەجاخ رۆشنییە.

٣٥. ئاگر وە ئاگر ناقوژێتەوە.

٣٦. ئاغە چل کوڕی بوو وجاغی کوێر بوو.

٣٧. ئاغەڕۆ، خواشوکر.

٣٨. ئاڵی ئەگەر ماڵی بکردایە لە وڵات خۆیا پەڵەی گاڵی ئەکرد.

٣٩. ئاڵتوون و پارچە و ژن، لە رۆژی رووناکا هەڵبژێرە.

٤٠. ئاڵتوون بە مەحەك، پیاو بە تەجروبە.

٤١. ئامیان حەوت قازان شیرە.

٤٢. ئامێژەن حەفت قازانگ ماسە.

٤٣. ئاو ئەڕوا، زیخ ئەمێنێتەوە.

٤٤. ئاو ئەگەر لە جێگایەکدا بوێسێ ئەگەنێ.

٤٥. ئاو بێ لەغاوی خواردووەتەوە.

٤٦. ئاو بە بێژنگ ناپێورێ.

٤٧. ئاو بە گوریس نابەسرێ.

٤٨. ئاو بوێسێ تۆ نەوێسی.

٤٩. ئاو بوێسێ وە بێژنگەوە، قسە ناوێسێ وەدەم ژنەوە.

٥٠. ئاو بێراو دەس بشۆرە.

٥١. ئاو پەڵکم دا، خزمەت زەلم کرد، ئەك ڕەنجەڕۆ خۆم، چۆن بۆ خەڵکم کرد.

٥٢. ئاو جاوین.

٥٣. ئاو خەسەوکردن.

٥٤. ئاو دەکاتە بێژنگدا.

٥٥. ئاو زابییە دەمی.

٥٦. ئاو سارد و بەرەو ژوورکێی قایم.

٥٧. ئاو سەرچاوەی قوڕاوە.

٥٨. ئاو شوێن خۆی گوم ناکا.

٥٩. ئاو چاوی زابییە.

٦٠. ئاو گۆزەی سوور، حەفتەیەك خۆشە.

٦١. ئاو کریا مل ئاورا.

٦٢. ئاو کوچك تێرێتە دەنگ.

٦٣. ئاو لە ئاسیاو کەفت.

٦٤. ئاو لە ئاو تەکان ناخوا.

٦٥. ئاو لە ئاوەڕێژەوە ئەڕوا.

٦٦. ئاو لە خەوا، ڕۆشناییە.

٦٧. ئاو لە دەستی ناتکێ.

٦٨. ئاو و ئاور ئامانیان نییە.

٦٩. ئاو هیچ کات ڕێگا گوم ناکا.

٧٠. ئاوێ کە ڕژیا جەم نابێتەوە.

٧١. ئاوێ وە ئاوەڕێژا بڕوا، ناگەڕێتەوە.

٧٢. ئاور بەر بووەتە کای کۆن.

٧٣. ئاور خۆڵەکەووی لـێ درووست ئەوێت.

٧٤. ئاور قۆرەت.

٧٥. ئاور کەوێتەوە، تەڕ و وشك بە یەکەوە دەسووتێنێ.

٧٦. ئاور نەکەفێتە کای کۆن.

٧٧. ئاور وە ئاور خامۆش ناوێت.

٧٨. ئاورە سوورە لە خۆم دوورە.

٧٩. ئاوری پێوە بنێی، بۆسۆی لێ هەڵناسێ.

٨٠. ئاوی پیس چت پاك ناکاتەوە.

٨١. ئاوی ڕروون ماسی تیا نییە.

٨٢. ئاوێك هاژە و دەنگی زۆر بێت، قووڵ نییە.

٨٣. ئاهەن سارد مەکوتە.

٨٤. ئای کلۆڵم من کلۆڵم، ژنم هاوردە، ئێستە بێپووڵم.

٨٥. ئەو کەسە کە قون ئەدا مەرد مەیدانە، ئەو کەسە کە قون ئەکا ماڵ وێرانە.

٨٦. ئەتۆریّ، ئەیژی لە نان و کەرەی دایکی ئەتۆریّ.

٨٧. ئەتەویّ نەمری، چاکە بکە.

٨٨. ئەترِیّ وە پرخە دای ئەهێریّ.

٨٩. ئەترِیّ ئەیژی کەر سێف فرۆشە.

٩٠. ئەتسیّ و بەر باکەیش ئەگریّ.

٩١. ئەتوانن ماڵت لە دەس وەرگرن، ناتوانن رێگای لای خوات لـێ ببرِن.

٩٢. ئەتوانی میهرەبانی کە، دووژمنت وە زوان، گیانی، گیانی کە.

٩٣. ئەجەل رۆژژمێری نییە.

٩٤. ئەحمەق هاوەشوێن ئەوەوە لە هەنگەژاڵەیش هەنگوێن بگریّ.

٩٥. ئەدا لە یەکێکی‌تر، هەرەکیە تۆ بترسێنیّ.

٩٦. ئەداتە لای خەرمانا، ئەیژیّ ماشەڵلا، ئەگەر وە سەوزی نەخوریاویّ.

٩٧. ئەریّ ئەزانی شوەکەت خراوە، وە رێزەییّ دەرمان بیخە ئەولاوە.

٩٨. ئەریّ ئەزانی قاتر قیمەت باش ئەکا بۆ ئەیفرۆشی.

٩٩. ئەریّ بەختەکەت لـێ بێتە سەر، بووك لە ژێر پەردەوە لیّت ئەبیّ بە نێر.

١٠٠. ئەریّ بواریّ تەلاّ لە بابێر، نەزان چووزانیّ قەوری جەواهێر

١٠١. ئەریّ سەو وەبەر دریا کەما برِوا، شەرحی پیّ ئەکەم.

١٠٢. ئەریّ چتێکت وەچاو نەیوینیوێت گوناحە باسی بکەی.

١٠٣. ئەریّ قسەم راس وێت، جێی وشترێك درووس ئەکەم.

١٠٤. ئەریّ قینم هەڵسێنی، وەك چێشت مجێور، ئەیشێوێنم.

١٠٥. ئەریّ مەل وە دارۆ نەمێنیّ ، میوە وە دارۆ ئەمێنیّ.

١٠٦. ئەرێ وە تڕپنیش وێت کەریش ئەتڕێت.

١٠٧. ئەرێ وە قسەی مشك بکەی پشی ئەخوا.

١٠٨. ئەرێ هەرەکتە پیاو زۆڵ بناسی، لە زەماوەنا بچۆ پاڵ دەسی.

١٠٩. ئەرزش کەنیشکێ وەقەو دوو کوڕە.

١١٠. ئەرێ فەقیری بەچیت بێژم خاس، تاوسان پاپەتی زستان بێکراس.

١١١. ئەزانێ هەس وەلێ نازانێ چەس.

١١٢. ئەستێرە هەرچی پرشنگدار وێت، نابێ بە مانگ.

١١٣. ئەسپ ئەو ئەسپەیە، لەژێر ساحێویا نەلەنگێ.

١١٤. ئەسپ پێشکەشی دیانی ناژمێرییێ.

١١٥. ئەسپ لە میری بکەوێ، دیانی ناشکێ.

١١٦. ئەسپ وە جوانی، جوانە.

١١٧. ئەسپی گوم کردە، وە دوای نالّیا ئەگەڕێ.

١١٨. ئەسپی نییە ئاخوڕی بۆ هەڵئەبەسێ.

١١٩. ئەسپیان ناڵ ئەکرد کەر سمی بەرزەو کرد، ئەیوت: منیش.

١٢٠. ئەسڵەحەی ژن زووانیە.

١٢١. ئەزمەڕ وەو لێژییە، مۆنیکا وەو تیژییە، کوڕەکەی ئەحە وەو گێژییە.

١٢٢. ئەشرەفی چکۆلەیە و قیمەتی زۆرە.

١٢٣. ئەچێتە بان پووزڵ ئاو قنی بچنێ.

١٢٤. ئەگەر ئاسایشت ئەوێ، لە پێشا بزانە هاوساکەت کێیە جا ماڵ بکڕە.

١٢٥. ئەگەر ئەتەوێ لە موعامەڵە فێڵت لێ نەکەن لە دوو سێ دووکان نرخ بپرسە.

١٢٦. ئەگەر ئەترسی چیتە لە لووس و پووسی.

١٢٧. ئەگەر ئەمجارە بووم بە بووکی ماڵان، ئەزانم چۆن شەرم بکەم.

١٢٨. ئەگەر ئەوینی لە خەڵك بێزاری، بڕۆ خۆت ئیسلاح کە چۆنکە بیماری.

١٢٩. ئەگەر بۆ ئاو بچێت، کانی وشك دەکات.

١٣٠. ئەگەر بۆ نان شەویش داماگی، ئەو کارە مەکە.

١٣١. ئەگەر باوکیمان نەدیبایێ، ئەیوت بەچکە وەزیرم.

١٣٢. ئەگەر ببی بە پۆلاً دنیا بگری لە کۆلاً، ئەبێ بڕزی لە خۆلاً.

١٣٣. ئەگەر بە ریش بێت، بزن سۆفییە.

١٣٤. ئەگەر بەختم خاس وایەت نیشانەی چەپم لە لای ڕاسماو.

١٣٥. ئەگەر بەو بێلێ، گوری و مەڕ وەیەکەوە ئاو ئەخۆنەوە.

١٣٦. ئەگەر برا شوانە، خۆیشك چاوەڕوانە.

١٣٧. ئەگەر بزن باکی لە عەیبە بوایە، کلکی شۆڕ دەکردەوە.

١٣٨. ئەگەر بێت و تاوانبار بگرن، کەس نییە بێ تاوان بێ.

١٣٩. ئەگەر تۆ زێڕی، منیش زێڕنگەرم.

١٤٠. ئەگەر تۆ نەبی بە یارم، خوا دەسازێنێ کارم.

١٤١. ئەگەر تۆ نەوی لە ماڵما سەو ئەتڕێ وەحاڵما.

١٤٢. ئەگەر تۆ یەك مەنی، من دوو مەنم، بێجگە لە ساقی گەردنم.

١٤٣. ئەگەر تەماتە بەهەشت بنۆشی، نەوسێ کوێر بکە و سڕێ بپۆشە.

١٤٤. ئەگەر تەماتە دۆس بکەیتە سەر، گۆزەی ئاوەکەو شەو بنە وەدەر.

١٤٥. ئەگەر ترس هات، قەپەکەوڵە پێش تانجی دەکەوێ.

١٤٦. ئەگەر پارەت بێ، وەك ئەژدیهای، ئەگەر پارەت نەبێ کرمی.

١٤٧. ئەگەر پرسیار هەیە، وڵامیش هەیە.

١٤٨. ئەگەر پیاو ئامەوی وێت دوشمنەکەی کەرە.

١٤٩. ئەگەر جویرەئیل کەی بە رەهبەری، لەسەری ناچێ رەوشتی کەری.

١٥٠. ئەگەر وشتر باڵی بوایە، لەسەر بانان دەنیشتەوە.

١٥١. ئەگەر خاسە حەیفە بۆ خەڵك، ئەگەر خراوە عەیبە بۆ خەڵك.

١٥٢. ئەگەر خەو بە مردنی کسێکەوە ببینی، عومری سەر لە نوێ دەنووسرێتەوە.

١٥٣. ئەگەر خەوت بە کەسێکەوە دی، سەرینەکەت بارەوبار بکە با خەوت پێوە ببینێ.

١٥٤. ئەگەر خەوت تێ، ژێر سەرت بۆ چەس، ئەگەر برسیتە پێخۆرت بۆ چەس.

١٥٥. ئەگەر خودا مەیلی بێت شەوی تاریك ئەکا بە رۆژی رووناك.

١٥٦. ئەگەر داری پیر جێبەجێ‌کەی وشك دەبێ.

١٥٧. ئەگەر دار بۆ خۆی سێبەری نەبێت، بۆ خەڵك هەیەتی.

١٥٨. ئەگەر دەنگم خۆش بوایە، تۆزێك دەگریام.

١٥٩. ئەگەر دز مەیل دزی بوێت، هەر تاریکەشەو فرەس.

١٦٠. ئەگەر دزت لە ماڵی خۆت بوو، دەرگەگرتن بەلاشە.

١٦١. ئەگەر دز و ساحێوماڵ یەك بن، گا لە کولانجەوە ئاوا دەکەن.

١٦٢. ئەگەر دوشمنم تۆ بیت، نان و ماس لە تەکتا ئەخۆم.

١٦٣. ئەگەر ژنخوازی، مەرد و مەردانەگی.

١٦٤. ئەگەر رۆستەمی لە نەوەی زاڵی، هیچ قەدرت نییە چونکە بێ ماڵی.

١٦٥. ئەگەر سوار مەیلی بێت، لە تەك پیادا دەست و مشتاق ئەکا.

١٦٦. ئەگەر شانس نەیتێرێ، دەڵەمە دیان ئەشکێنێ.

١٦٧. ئەگەر شەیتان بمردایێت زۆر کەم لەبەر رەزای خوا ئیشیان ئەکرد.

١٦٨. ئەگەر عەقڵی ئاخری هێن ئەوەڵی بوایێ، وایی بەسەر نەئەهات.

١٦٩. ئەگەر گۆشت گران بووێت خواردنی هەرزانە.

١٧٠. ئەگەر گاسوور جووتی کردایێ با لە سووورداش بیکردایێ.

١٧١. ئەگەر گەرەکتە تاڵی نەکێشی، وەقەو بەرەی خۆت پا دابکێشە.

١٧٢. ئەگەر گەرەکتە کەنیشك بخوازی، بڕوانە لە پاڵ دامەن و کراسی.

١٧٣. ئەگەر غەریبی لای من حەبیبی.

١٧٤. ئەگەر فیل کەوتە ناو قوڕێ، دەبێ هەر فیل دەریبێنێ.

١٧٥. ئەگەر قسەکردن زێوە، نەکردنی زێڕە.

١٧٦. ئەگەر قنگت ناخورێ لە خرۆش، چیتە وەکاورای تەماکۆفرۆش.

١٧٧. ئەگەر کۆتر لە تەك قالآوا بێت، رەنگی رەش ناوێت بەڵام دڵی رەش ئەوێت.

١٧٨. ئەگەر کەر رابگری، ئەبێ بۆنی تەرسەقول بکەی.

١٧٩. ئەگەر کەر نەیێتە بن بارێ دەبێ بار بچێتە بەر کارێ.

١٨٠. ئەگەر کەرن بەرابەرن، ئەگەر ئێسترن سەربەسەرن.

١٨١. ئەگەر کەسێك خەو بە خوێنەوە ببینێ، خەوەکەی بەتاڵ دەبێ.

١٨٢. ئەگەر کوندەبوو کلکی بوایە، راوچی بەجێ نەئەهێشت.

١٨٣. ئەگەر کوێرێ، کوێرێ هیدایەت بکا، هەر دوو دەکەونە ناو چاڵەوە.

١٨٤. ئەگەر مەڕ و ماڵات لە گەوڕا پا کوتێتە عەرزا، چتێ ها وەدەمیەوە.

١٨٥. ئەگەر مریشکی، بۆ هێلکەکردن لاسایی قاز مەکەوە.

١٨٦. ئەگەر من رازی وم وە نانێکی جۆ، چیمە لە خاقان چیمە لە خسرەو.

١٨٧. ئەگەر مێرووله نەوێت دنیا ئاخر دەبێ، کەر جەجاڵ کۆپان درووست ئەکا، مێرووله نایێڵێ.

١٨٨. ئەگەر ناتوانی دۆست پەیا بکەی، دوژمن پەیا مەکە.

١٨٩. ئەگەر ناتوانی قەپ بگری، دیان نیشان مەدە.

۱۹۰. ئەگەر نەزانی، چاو بدە بە جیرانی.

۱۹۱. ئەگەر نەمدیایێ باوکت، ئەمردم لە عەزرەت دایکت.

۱۹۲. ئەگەر نەیخۆی، بۆت ئەخۆن.

۱۹۳. ئەگەر وەتەن کەوتە دەس گورگان، گورگی وەتەن بیخوا تا گورگ بێگانە.

۱۹٤. ئەگەر وتی ماس سپییە، باوەڕی پێ مەکە.

۱۹٥. ئەگەر وشتر خاسە، بۆ خۆت سواری ناویت.

۱۹٦. ئەگەر هۆشت نەوێ، قشقەڕە چاوت دەرئەهێنێ.

۱۹۷. ئەگەر هەر ئەوەسە، هەر ئەمە بەسە.

۱۹۸. ئەگەر هەرەکتە خەوەر بزانی، گۆزەکەو هەڵگرە و بچۆ بۆ کانی.

۱۹۹. ئەگەر هەرەکتە کوڕ بناسی، بڕوانە لە عاساکەی دەسی.

۲۰۰. ئەگەر هەموو تەیرێك هەنجیرخۆر بوایە، بەش خاوەنەکەی نەدەما.

۲۰۱. ئەگەر هەنگوێن بی، مێش دەتخوا.

۲۰۲. ئەگەر هیچ نازانی، گۆچان هەڵگەرە بچۆ بۆ شوانی.

۲۰۳. ئەگەر هێلکەوڕۆن بنیتە بەر کەر، گوێچکەی تێ ئەخا.

۲۰٤. ئەلەرزم وەك پاربەن.

۲۰٥. ئەڵقەڕێزی دونیایی، کەچەڵ چوو بۆ ناو شایی.

۲۰٦. ئەڵێن وە تەمەڵ وەرە سێوەر، ئەڵێ سێوەر بێ بۆلام.

۲۰۷. ئەڵێی سۆنەیە نە تەڕ ئەبێ، نە لەڕ ئەبێ.

۲۰۸. ئەڵێی فۆتەی حەمامە، هەر ڕۆژێ هاوەبەر یەکێکەوە.

۲۰۹. ئەم تەونە تۆ ناتەسەوە، خوری خوڕخوڕەی[1] هەرەکە.

---

١ـ ناوی گوند و ناوچەیەکە لە دەور و بەری سەقز.

٢١٠. ئەم ترِی و ئەو دەرپەرِی.

٢١١. ئەم حەقە بەو حەقە، پیرەژن چۆك رەقە.

٢١٢. ئەم دەسە لەو دەسە چلك ناگرێ.

٢١٣. ئەم دونیا بە پفێك و سەورێك درووست کراوە.

٢١٤. ئەم ساڵ تا ئەو ساڵ فەرەجێکە.

٢١٥. ئەم گشتە کونە بۆ من ناگیرێ.

٢١٦. ئەم قسە لێرا بچێتە عەرزا.

٢١٧. ئەم کارە ئێوە کردتان بووە مێوانی حاجی لەقلەق و رێوییەکەوە.

٢١٨. ئەم مەشکە وە بان ئەم سێپاوە ناوێسێ.

٢١٩. ئەم وشترە لە بەر ماڵ هەر کەسێکا ئەخەفێ.

٢٢٠. ئەم هێلکە وەبان ئەم تەنافەوە ناوێسێ.

٢٢١. ئەمانەت بەرە دەس خاك خەیانەتی پێ ناکا.

٢٢٢. ئەمە ریش و ئەمە قەیچی.

٢٢٣. ئەمرِۆ دونیایە و سبەی قیامەت.

٢٢٤. ئەمرِۆ لە منە، سەوزیش لە تۆس.

٢٢٥. ئەمساڵ ساڵ مەیموونە، ئەمە ئەوەڵیە ئاخری چۆنە.

٢٢٦. ئەنگوس ئەژەمە خوێیا بۆت.

٢٢٧. ئەو ئاوەت تێکەڵ شیر کرد بووە لافاو و مانگازەردی برد.

٢٢٨. ئەو بێژێ سیر و من بێژم پیاز قەوی قەوی.

٢٢٩. ئەو بێژی من و ئێمە بێژین میاو.

٢٣٠. ئەو پردە تۆ ناوی ئەوەی، زەمانێ لەوێدا من کاروانچی بووم.

٢٣١. ئەو خورما تۆ خواردت من بە ناوکەکەی بازی ئەکەم.

٢٣٢. ئەو دەرسەی تۆ خوێندووتە من لە بەرمە.

٢٣٣. ئەو دڕکە لەژێر پات دەر تێرم.

٢٣٤. ئەو چێشتە، خۆش چێشتەنە، کێ کەردەنە، پیسەی قەڵەن چەسەنە، خۆم پەلێکم تێ وەردەنە.

٢٣٥. ئەو قەڵا تۆ دەستت پێوە گرتە وێڵی کە با بڕووخێ.

٢٣٦. ئەو کاڵا لایەق ئەو باڵاس.

٢٣٧. ئەو کەسە ئەسیری عادەتە لایەقی ژیان نییە.

٢٣٨. ئەو کەسە پیاوە ڕەنگێ بدۆینێ، ئیمڕۆ نەیگۆڕی ڕەنگ و ڕووی دوێنێ.

٢٣٩. ئەو کەسە کەسە، قسەیەکی بەسە.

٢٤٠. ئەو ماسە بێ موو نییە.

٢٤١. ئەو نانە نانە، ئەمڕۆ لە خوانە.

٢٤٢. ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا.

٢٤٣. ئەوە حەساوە مەڕ لە تەك گوریا ئاو بخوات.

٢٤٤. ئەوە کوڕە زۆڵەکەی شەریف ڕەنانە، لێتان بگرێ بەهانە، ئەتان جنێ وەك سیر ناو کەلانە.

٢٤٥. ئەوە کوڕە، کێف هەڵدڕێ.

٢٤٦. ئەوە لای بەنە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە.

٢٤٧. ئەگەر دەتوانی لە دیوار سەرکەوی، بۆ دزی ناکەی زل و ملقەوی.

٢٤٨. ئەگەر ئەمزانی چ ڕۆژێ ئەمرم، یانەی سواڵیم خراو ئەکردم.

٢٤٩. ئەوەڵ ئەپرسن هاوسا وەزەنی، دووەم ئەپرسن دایك و فەرزەنی.

٢٥٠. ئەوەڵ بەخت تیکەی نەخت، دووهەم بەخت کۆسی سەخت.

٢٥١. ئەوەڵ تماشای دار بکە، دوای لە ژێریا دانیشە.

٢٥٢. ئەوەڵ چلە، ئاخر چلە، مە لەو ملە، هەر کە ئازاس با لەو ملە.

٢٥٣. ئەوەڵ قەورسان پڕ ئەکەن دوایی ماڵ.

٢٥٤. ئەوەڵ قسە بکوڵێنە دوایی بیە دەشتەوە.

٢٥٥. ئەوەڵ نان مەخۆ، ئەوەڵ ژنت دەمرێ.

٢٥٦. ئەوەنە بڕۆ بۆ باوان، جلێ بننە داوانت.

٢٥٧. ئەوەنە بچۆ حورمەتت نەچێ.

٢٥٨. ئەوەنە لە نەزەر ئەترسێ لە خوا ناترسێ.

٢٥٩. ئەوەنە مەچۆ ماڵان، تەماشات بکەن وەك مناڵان.

٢٦٠. ئەوەندە دۆست ئەیکا بە دۆستی، دوژمنێك نایکا.

٢٦١. ئەوەندە دەمت دەیشێت با ئەوەندە پات بێشێت.

٢٦٢. ئەوەی باوکی مەلەوان بوو، کوڕەکەی ئاو بردی.

٢٦٣. ئەوەی تێدەگا زوو پیر دەبێ.

٢٦٤. ئەوەی کە بە ها هات بە هوویش دەڕوا.

٢٦٥. ئەوەی کردووتە کاسەیەك بیکە کەوچکێك.

٢٦٦. ئەوەی لە عامە لە عالەمە.

٢٦٧. ئەوەی وا فێری کرد قسە بکەی حەقی هاوە ملتەوە.

٢٦٨. ئەوەی هەڵ ئەکەوێ بۆ گووکەر، هەڵ ناکەوێ بۆ راوکەر.

٢٦٩. ئەولاد خۆشی دڵ و ئازاری گیانە.

٢٧٠. ئەونە بنە شوێن دزەوە، دز لێت نەگەڕێتەوە.

٢٧١. ئەونە پای گەورەس ئەیژی پای تەیمانقەڵاییە[1].

٢٧٢. ئەونە پەلەیان لێم کرد، هەر تك پام کردە کەوشێ.

٢٧٣. ئەونە پێچ ئەوا لە خۆی، ئەیژی مار نیمە گیانە.

٢٧٤. ئەونە جەمەو بوو لەم هێشە و مێشە، وەبەر ناکەوێ یەك دانە پیشە.

٢٧٥. ئەونە جوانە ئەیژی مانگ چواردەس.

٢٧٦. ئەونە خەسیسە تووك تس ئەگرێتەوە.

٢٧٧. ئەونە خەفتیت تورشیایتە.

٢٧٨. ئەونە سەرم شلۆقە، ناتوانم سەرم بخورێنم.

٢٧٩. ئەونە شیرینی وەیتە خڵتەی بن گون.

٢٨٠. ئەونە فێڵەوازە کلکی لە رێوی کەمترە.

٢٨١. ئەونە قسە ئەکا ئەیژی گەوج گاوەشەلەس[2].

٢٨٢. ئەونە نەسێحەت کە پێت نەڵێن بەسە.

٢٨٣. ئەونە وێسام ئاو پام هات.

٢٨٤. ئەونەمە خواردە شەلەم و برۆێش، ناتوانم برۆم خۆم ئەکەمە کێش.

٢٨٥. ئەی برای ئازیز، مەدڕە پەردەی کەس، خۆت لە پشت پەردە عەیب و عارت هەس.

٢٨٦. ئەی بێسان بێ سەرەخەرە.

٢٨٧. ئەی دارەکەی پا لە موغاربەن، بۆچی پۆشاوتە بەرگی رەنگاوڕەنگ.

٢٨٨. ئەی ماسە تورشەی تۆژی لە بان پشت، من تۆم نەخوارد تۆ بۆ منت کوشت.

٢٨٩. ئەی وەویەکەی قەپڵەقۆنە[1]، ئەمە ئەوەڵتە، ئاخرت چۆنە.

---

١ـ گوندێکە لە ناوچەی تیلەکۆی سەر بەشاری سەقز کە خەڵکی ئەو گوندە بە پای زل بەناویانگن.

٢ـ ناوی گوندێکە لە دەوروبەری سەقز کە خەڵکەکەی بە گەوجیەتی بەناو بانگن.

۲۹۰. ئەیژی کوێر سپیێ وەمشت کەوتووە.

۲۹۱. ئەیژی هەنگی لە قوڕ و گوێزا دۆزرایتەوە.

۲۹۲. ئەیژێ کەرەکەی من بووەنە لای ئەسپەکەی خان بیوەسنەوە.

۲۹۳. ئەیژن سەفەر زۆر باشە لە کەر ئەکێشێ خاشە.

۲۹٤. ئەیژن چارەوای خاست بوێت کە لەدەس هاوسای خراو هەڵبێت.

۲۹٥. ئەیژن فلان کەس پیاوێکی مەنە.

۲۹٦. ئەیژن فلان کەس نەو کیسەس.

۲۹۷. ئەیژن وە رێوی خورما ئەخۆی یا مێوژ، ئەیژێ خورمیش.

۲۹۸. ئەیژن وە قرپاشان مەوتەنت کوێس، ئەیژێ با ئەزانێت.

۲۹۹. ئەیژن وە کاورا هەر دیانی لە خۆیە.

۳۰۰. ئەیژی تس دەسی بڕیە.

۳۰۱. ئەیژی جیوەی تێ کریا.

۳۰۲. ئەیژی دێوە شەلەیە، هەر ئەڕوات و بۆڵەی تێ.

۳۰۳. ئەیژی سەوەتەی پەت بڕیاویت.

۳۰٤. ئەیژی سوەیل[2] سەردار خەلیلە.

۳۰٥. ئەیژی شەڕ دۆنار و هەمەوەیسییە[3].

۳۰٦. ئەیژی گەنەی لای قن گاس چەسپیا پێمەوە.

۳۰۷. ئەیژی گیسکەکەی هەیاس خاسە، نە لاغر ئەوێت نە قەڵەو.

---

۱ـ مەبەست لە ژنێکی قەوی و قۆڵ بوو، کاتێك مێردی کردووە هەر لە ڕۆژی هەوەڵەوە نەتوانکار و خراپ بووە و وایـان پێ گوتووە.

۲ـ ژنێکی زۆر بالابەرز و جوان بووە کە مێردی بە پیاوێکی دەرەبەگ و بەناوبانگ بەناو سەردار خەلیل کردووە.

۳ـ ناوی دوو عەشیرەتی ناوچەی تیلەکۆن.

٣٠٨. ئەیژی فەرهاد کۆکەنە.

٣٠٩. ئەیژی لۆتی دمەك دڕیاوە.

٣١٠. ئەیژی لە پشت کێوەوە هاتوویت.

٣١١. ئەیژی هارەکەر دنیا ئەکەم تۆ ئەیخۆی.

٣١٢. ئەیژی هەنگوێنە ها لە دەم گەمالاً.

٣١٣. ئیحترام دانە بۆ خەڵك باکەوشت بۆ دانێن.

٣١٤. ئیرس و میراس دەرمانی هەر دەردێکە.

٣١٥. ئیزڕائیل دوایین دوکتورە.

٣١٦. ئیشی بە پەلە خاوەنی شەلە.

٣١٧. ئێمە خراویمان ئەوەسە لە پشت سەرەوە کەچەڵێن.

٣١٨. ئینسان بە سەد ساڵ جا دەگا بە کەماڵ، بەڵام بۆ بەدناوی یەك ڕۆژی بەسە.

٣١٩. ئینسان پارە درووس دەکات، پارە ئینسان درووس ناکات.

٣٢٠. ئینسان دەمرێ ناوێك لە دوای خۆی بەجێ ئەهێڵێ.

٣٢١. ئینسان سەد ساڵ ناژی، وەلێ خەفەت هەزار ساڵ ئەخوات.

٣٢٢. ئینسان عەیب خۆی ناوینێ.

٣٢٣. ئینسان لە پشت زمانییەوە حەشار دراوە.

٣٢٤. ئینسانی تەمەڵ، بەقەو چل وەزیر عەقڵی هەس.

٣٢٥. ئینسانی تەمیس زوو پیس ئەوێ.

٣٢٦. ئینسانی درۆزن یاوەری نییە.

٣٢٧. ئێوە مەڕدار، ئێمە دۆدار.

٣٢٨. بۆ ئەونە سڕی ئەیژی مار زمسانی.

٣٢٩. بۆ بەرخی هەژار، چ گورگ چ سوار.

٣٣٠. بۆ تاقە دۆس خۆت پیر و کۆر مەکە.

٣٣١. بۆ خۆی نازانێ بڕوێش بکات بۆ خەڵك پڵاو دەکات.

٣٣٢. بۆ دەسماڵێ، قەیسەرییێکی سووتان.

٣٣٣. بۆ دەوڵەمەندی عادەتە بۆ فەقیری عیبرەتە.

٣٣٤. بۆ دز، دزی لە مانگەشەودا خۆشە.

٣٣٥. بۆ دڵی خۆش هەردەم بەهارە.

٣٣٦. بۆ ژنی لاڕێ و پیاوی بەدنمەك، لە بەهەشتەوە هاتووە کوتەك.

٣٣٧. بۆ سێف مەچۆ ژێر دار چنار.

٣٣٨. بۆ شکێ ماڵ خۆت ئاور مەدە.

٣٣٩. بۆ شێو شەو موحتاجە.

٣٤٠. بۆ گشتیان دایکە و بۆ من باوەژن.

٣٤١. بۆ قسە ناگەڕێ.

٣٤٢. بۆ قسە ناکەی ئەیژی قاویتیان کردەسە دەمت.

٣٤٣. بۆ کەرێك دەگەڕێ، کوتەناڵێکی پێوە بێ.

٣٤٤. بۆ کەسێ بتڕە کە بۆت تری بێت، ئەو لە تۆ زیاتر قن خۆی دڕیبێت.

٣٤٥. بۆ کەسێ بمرە بۆت بمرێ.

٣٤٦. بۆ کونێ هەزار کونی کردە خۆی.

٣٤٧. بۆ کوێر هەڵپەڕە بۆ کەڕ گۆرانی بێژە.

٣٤٨. بۆ مردووان هەر رەحمەت خاسە.

٣٤٩. بۆ نەوس خۆی خستە حەوز.

٣٥٠. بۆ وا تماشا ئەکەی، ئەیژی کەر زاییە و کەرکوڕی بووە.

٣٥١. بۆ هەر کەرێ ئاخوڕێ هەڵ ناوەسن.

٣٥٢. بۆ هەر کوێ بچم هەر نان و پیازەکەس.

٣٥٣. بۆرە نەوەێ بازە وێت، دەسکە و سارەکەی تازە وێت.

٣٥٤. بۆچی گورگ بە ژەمارە ناخوات.

٣٥٥. بۆی خوێنی لێ تێت.

٣٥٦. بۆی نییە، شەلە دۆی نییە.

٣٥٧. بۆیە بەفری شکاندووە، ئاوی سارد بخواتەوە.

٣٥٨. بۆیە پێت ئەیژم کاکە ژنم بۆ بێنی.

٣٥٩. بۆیە پێت دەڵێم کاکە چۆلەکەم بۆ بگری.

٣٦٠. بۆیە هاوین خۆشە، کەس ناڵێ مامە کۆشت داپۆشە.

٣٦١. بێ ئیشی نەخۆشییە.

٣٦٢. بێ پیاوەتی کە دەرحەق بۆرەپیاو.

٣٦٣. بێ حەیا عاری نییە، دارێ تەڕ وەقنی.

٣٦٤. بێ دەرپێ، دوو گەز جاوو لەخەو ئەبینێ.

٣٦٥. بێ دەنگی گەنجینەی پیاوە.

٣٦٦. بێ رەزای خوا گەڵا لە دار ناکەوێتە خوار.

٣٦٧. بێ سوڕنا هەڵئەپەڕێ.

٣٦٨. بێ شەڕ دانیشە و شەڕ دەرگات پێ دەگرێ.

٣٦٩. بێ چەق گوڵی کرد.

٣٧٠. بێحەیا ئەیژێ ئەونە خاسم تا دەمم تاڵ ئەوێت.

٣٧١. بێدەنگی لە نەزانین چاکترە.

٣٧٢. بێعاریان لە نێو جەواڵ ئەنا، سەری پەنجەی خۆی دەرئەهێنا.

٣٧٣. بێکەسی هەر بۆ خوا خاسە.

٣٧٤. با گوڵە بێتەو لە کانی، دانێ گۆزەکەی شانی.

٣٧٥. با وەلای کەرا، کۆپانەکەی لێ ئەگرێتەوە.

٣٧٦. با هەر سیر بخوا و زوڕنا بژەنێ.

٣٧٧. با بارانی لە دوایە، پیرەژن شەڕ و ئاژاوە.

٣٧٨. بابۆڵەم پێ بەن سوارکەرم کەن، خێر باوکم ئەکەم شوانییان بۆ نەکەم.

٣٧٩. باج سمێڵ ئەگرێ.

٣٨٠. باج لە باج ناناڵێت.

٣٨١. باخ بە بێ پەرچین زینەتی نییە، کچ بە بێ باوان حورمەتی نییە.

٣٨٢. باخەوان لە وەخت باخا کەرە.

٣٨٣. بار سووك زوو ئەگاتە ماڵ.

٣٨٤. بار قورس بڕ مەنزڵ ناکات.

٣٨٥. بار کەچ بە سلامەت ناگاتە بەرەوە.

٣٨٦. باران ئەوارێ، کلۆ بۆ بەرد ئەگێرێ.

٣٨٧. باران بوارێ ئاشی ئەگەڕێ، خۆشەو کاتەو جووتی ئەگەڕێ.

٣٨٨. بارمان هەس و کەرمان نییە، کەرمان هەس و بارمان نییە.

٣٨٩. باڕن نشێو و هەوراز وەك یەك لێ دەکات.

٣٩٠. بارێ تفەنگ بنە لە کەر گورگ دەیخوا.

٣٩١. باری خەیانەت هەوار ناچێ.

۳۹۲. باری کەر دایم قورسە.

۳۹۳. بازەم نارد نەهاتی، بۆرەم نارد نەهاتی، خۆت وە گلوگلو هاتی.

۳۹٤. باس گوریان کرد، گورو حازر بوو.

۳۹٥. باشە کەم دێزە وە دەرخۆنە کە.

۳۹٦. باشترین مامۆستا تەجروبەیە.

۳۹۷. باڵا بەرزەکان هێلانەی داڵن، باڵا بووچکەکان فریشتەی ماڵن.

۳۹۸. باڵا لەوێنەی تۆسیە کەرانە[1]، هیچ مەکە هەتا ئێوارە هەر ئاو بێرانە.

۳۹۹. باڵاکەو بەرزە وەك کەنووە گڵێنە، پیوەی بەن ئەوی لە هەزار وێنە.

٤۰۰. بام خۆی خۆش نییە، ناوکەکەی خۆشە.

٤۰۱. بان دەس خۆی داخ کرد.

٤۰۲. بان رێگەی کوتیاو گەنمی سەوز ناوێت.

٤۰۳. بان زوانی سێ کیلۆ رۆنی هاپیوە.

٤۰٤. بانێك و دوو هەوا.

٤۰٥. باوان وەك قیبلە واسە ناچەرخێ.

٤۰٦. باوە دەرمی کرد هیوام دایە بوو، کەچی ئەو گۆشتەیش هەر لەو گاڵە بوو.

٤۰۷. باوەحیزخاوەن نە بۆ سەیر خاسە، نە بۆ زەماوەن.

٤۰۸. باوەڕی بە بانگی موحەممەد نییە، ئیمانی بە سەرەی نێرەکەر هەیە.

٤۰۹. باوك بێبرا و ئامۆزای فرە.

٤۱۰. باوك بە جۆرێك ئەیکا، کوڕ بە جۆرێك ئەیدا.

٤۱۱. باوك بەلاس، دایك قەزاس، ژن خاس نێعمەت خواس.

---

۱ـ تۆسیەکەرانە، ناوی جۆرە گیایەکە کە زۆر درێژ و لەڕ و لاوازە.

٤١٢. باوکمردوو واز تێرێ، نانخۆر واز ناهێنێ.

٤١٣. باوك و دایك ئەووەنە بان دار، بەلاّم براو براژن ئەوتێرنە خوار.

٤١٤. بایەقوش لەسەر وێرانە دەخوێنێ.

٤١٥. بە ئاو کانیاو تێر ناخوات، ئیسە بە تکەتکەی لۆکە.

٤١٦. بە ئاو هات و بە نان خوریا.

٤١٧. بە ئەحمەد و مەحموو قەرزارم.

٤١٨. بە هۆی بزن قوتەوە لە دۆی دراوسێ بڕیاین.

٤١٩. بە باڵۆڵیان وت: زەماوەنە، وتی وە من چی، وتیان ئاخر زەماوەن تۆس، وتی بە ئێوە چی.

٤٢٠. بە باوەڕ دز هەمووکەس دزە، بە باوەڕ گەڕاڵ هەموو کەس گەڕاڵە.

٤٢١. بە باوەڕ نەدار، دەوڵەمەند هەموو شەوێك پلاّو دەخوات.

٤٢٢. بە تاقەگوڵێك بەهار نابێت.

٤٢٣. بە تەمای شیری مانگا بۆرە.

٤٢٤. بە تەمای عامی دەچێتە شامی.

٤٢٥. بە تەمای مەلایی لە ئیمانی مەگەڕێ.

٤٢٦. بە تەنیا بگیرە و لەناو خەڵکا پێکەنە با دوژمنت پێخۆش نەبێ.

٤٢٧. بە تەنیایی بژیت، نەك لە ناو کۆمەڵێکی خراپا.

٤٢٨. بە ترێ حەوت مەن خوری شی ئەکاتەوە.

٤٢٩. بە تیرێك دوو نیشان لـێ دەدا.

٤٣٠. بە پەلە ژن مەهێنە با بە شێنەیی پەشیمان نەبیتەوە.

٤٣١. بە پشیلەیان وت: کام ماڵت پێ خۆشە، وتی: ئەو ماڵەی کابانی کوێر بێ.

٤٣٢. بە پشیلەیان وت: گووت بۆ دەرمان باشە، لە داخا کردیە ژێر خۆڵەوە.

٤٣٣. بە پیری دەچێتە بەر هەویری.

٤٣٤. بە جارێ دوو تەون مەکە بە دارا.

٤٣٥. بە جێوان پوولّی هەس.

٤٣٦. بە حەفت قەڵەم خۆی رازانەوە.

٤٣٧. بە حەفت ماڵەوە تیانەیەکیان هەس.

٤٣٨. بە خاڵۆ خاڵۆ هاتە لامەوە، بوو بە رەشەمار دایە پامەوە.

٤٣٩. بە خشەخش، خۆی کردە خاوەن بەش.

٤٤٠. بە خوێن سەری تینووە.

٤٤١. بە دۆستی تازە و ماڵی تازە باوەڕ مەکە.

٤٤٢. بە دۆسی دۆسی بکەنە پۆسی.

٤٤٣. بە دۆعای کەر جۆ نابارێت.

٤٤٤. بە داخ تۆوە سەری ناوە.

٤٤٥. بە داری تەماح هێندە هەڵمەچۆ.

٤٤٦. بە دەردی سەگی رەش چوو.

٤٤٧. بە دەس خۆم چیم کرد لە خۆم.

٤٤٨. بە دەس خۆی ئاگری بەردا گیان خۆی.

٤٤٩. بە دەس خۆی قەور خۆی ئەکەنێ.

٤٥٠. بە دەس قەرز بدە،بە پێ شوێنی کەوە.

٤٥١. بە دەسێ دوو شوتی هەڵناگیرێ.

٤٥٢. بە دەستی بەتاڵ هیچت بۆ ناکرێ.

٤٥٣. بە دەستی خۆت نەبێ، خورینی پشت نامرێ.

٤٥٤. بە دەستی من نەبێ بە دڵی من بێ.

٤٥٥. بە دەم کێیا بساوم.

٤٥٦. بە دەم هارە بە لەش بیمارە.

٤٥٧. بە دەوڵەمەند ئەڵێن موبارەکت بێ، بە فەقیر دەڵێن لە کوێت بوو.

٤٥٨. بە دوای کڵاوی بابردوو مەکەوە.

٤٥٩. بە دووی چوواندا مەچۆ.

٤٦٠. بە رۆژا هارە بە شەوا بێمارە.

٤٦١. بە رۆژە رۆژەساڵمان بردە سەر، ئەوا بەهار هات لەشمان کەفتە دەر.

٤٦٢. بە رێگەی شەڕا مەڕۆ.

٤٦٣. بە زبرەی پارە، بەردیش نەرم دەبێت.

٤٦٤. بە زمانی خۆش مار لە کون دێتەدەر.

٤٦٥. بە سەبر بە و بە زەبر بە.

٤٦٦. بە سەد بەرتیل قەرزێك داوژار ناوێت.

٤٦٧. بە سەدان نەدەچووە داوەتی، بە هەزاریش نەدەهاتە دەرێ.

٤٦٨. بە سەرم هات، باوەڕم نەهات.

٤٦٩. بە سەیدەوە خەو بینین تووشی مەئموورت دەکا.

٤٧٠. بە سووچ عیسا، مووسا مەگرە.

٤٧١. بە شەپڵاخە دەم و چاوی خۆی سوور ئەکاتەوە.

٤٧٢. بە شەنەکەی پەرتی دەکرد، بە گێرە خڕی دەکردەوە.

٤٧٣. بە شێتیان گوت بۆ شێتی، گوتی: بۆم ئەلوێ.

٤٧٤. بە شیرێ زاری سووتاوە، فوو لە دۆ دەکا.

٤٧٥. بە شیشە و مەمکەی خاڵی ئەیخەفێنێ.

٤٧٦. بە چاو برا و خۆیشکا ئەڕوانین بە یەکا.

٤٧٧. بە چاو خەفتگ و بە دڵ وریا.

٤٧٨. بە چاو لەیلی تماشای مەجنوون بکە.

٤٧٩. بە چاوی مشتەری تماشای بکە.

٤٨٠. بە چ عەیارێك بیپێوی، بەو عەیارە بۆت دەپێون.

٤٨١. بە چلە مەدە لە ملە.

٤٨٢. بە گایەك، گێرە ناکرێ.

٤٨٣. بە گورگیان وت: بۆ دەگری کارەکەت نان و ئاودارە. وتی: بۆیە دەگریم دەترسم درۆ بێ.

٤٨٤. بە گوریسی رزیو مەچۆ ناو چاڵەوە.

٤٨٥. بە گیان تۆ ئەم برە لەو تۆ برە نییە.

٤٨٦. بە عارەبێ مەڵێ مەرحەبا، هێندێکی دەخوا، هێندێکی دەنێ لەبن عەبا.

٤٨٧. بە عەسای دەڕوا، بە عەبای دەخوا.

٤٨٨. بە قەو دەم خۆت تیکە بگرە.

٤٨٩. بە قسە کار ئاسانە.

٤٩٠. بە قسە کار درووست نابێت.

٤٩١. بە قسەی خۆش کەمتیاریش لە کون دێتە دەرێ.

٤٩٢. بە قوربانی گەنج بم، را کردنیشیان لێ جوان دێ.

٤٩٣. بە کاسەیەك ئەیکەن و بە کەوچکێك ئەیخۆن.

٤٩٤. بە کەر ناوێرێ بە کورتان شێرە.

٤٩٥. بە کەری موسایی خۆی فێر ناڵۆەنی ئەکات.

٤٩٦.  بە کەشیێ هاتن بە فشێ ڕۆین.

٤٩٧.  بە کەوچکێك ئاو دەکەوێتە مەلە.

٤٩٨.  بە کلفەتی ئەیکەم و بە خانمی ئەیخۆم.

٤٩٩.  بە لای ژنەوە دەردەدڵ مەکە.

٥٠٠.  بە لای کەرا بڕوا کۆپانی دەگرێتەوە.

٥٠١.  بە لە تەختەی حیزی، وە بەختی.

٥٠٢.  بە لە هەرد، مەدە لە پردی نامەرد.

٥٠٣.  بە مانگ بچۆ میوان بە بە ساڵ بچۆ سوڵتان بە.

٥٠٤.  بە مشتومڕ نابێتە بڕ.

٥٠٥.  بە نانێ تێر بە نانێ برسی.

٥٠٦.  بە هەزار سووزەن، گاواسنێکی تیا نابێت.

٥٠٧.  بە هێڵە هێڵە، زەمین هین خۆمە.

٥٠٨.  بە یەك دەست چەپڵە ناتەقێ.

٥٠٩.  بەو چرای نەگرێ.

٥١٠.  بەجێی ئەوەکە لەحنەت لە تاریکی بکەیت، مۆمێك داگرسێنە.

٥١١.  بەخ مەکە، یەخ ئەکەی.

٥١٢.  بەخت سیاسەخت.

٥١٣.  بەخت وە بەخت ئەکەنێ.

٥١٤.  بەختێ لە ئەزەڵ فەلەك کەچ نیا، کەچ ئەندەر کەچەن تا ئاخر دنیا.

٥١٥.  بەختم لە هەموو شتێکدا ڕەشە، تەنیا لە شووتیدا سپییە.

٥١٦.  بەخت و شانس لە بازاڕ نافرۆشیێ.

٥١٧. بەخێڵ خۆی نایخوا، هەوڵیشی زۆرە.

٥١٨. بەدبەختی عەقڵیش کوێر دەکات.

٥١٩. بەر ژنەکەی ماچ ئەکا.

٥٢٠. بەر زەرەر لە هەر لاییێکەوە بگری، مەنفەعەتە.

٥٢١. بەر لەوەی شوو بکەی چاو باز کە، دوای شووکردن چاو بوەسە.

٥٢٢. بەرازی یەك روو باشترە لە پیاوی دووڕوو.

٥٢٣. بەرانسوار بە، بەڵام موتۆڕسوار مەبە.

٥٢٤. بەرەبەرە، شیر ئەوێتە کەرە.

٥٢٥. بەرەکەت ها لە زەویا ئەو تماشای ئاسمان ئەکا.

٥٢٦. بەرەو خوار و بەرەو ژوور، کەرەکوڵ و خورجەسوور.

٥٢٧. بەرەو ژوورەکە لە خۆت سەخت مەکە.

٥٢٨. بەڕەی فەقیر لە لای تەنکییەوە ئەدڕێ.

٥٢٩. بەرتیل بەرد نەرم ئەکا.

٥٣٠. بەرخ هەر لە ناو کۆزا نامێنێ.

٥٣١. بەرخی نێر بۆ سەر بڕین.

٥٣٢. بەرد ئەوەندە قورسە تا لە جێگای خۆی ئەجووڵێت.

٥٣٣. بەرد تاوسان هەڵگرە بۆ زمسان.

٥٣٤. بەرد تل بدە بێکار مەبە.

٥٣٥. بەرد سارد و گەرم نەیێتە بەر پات.

٥٣٦. بەردێ بگوشێ، ئاوی دەر ئەکا.

٥٣٧. بەردە خڕەی ناو دیوار.

٥٣٨. بەردی بووچکیش سەر دەشکێنێ.

٥٣٩. بەردی گەورە، نیشانەی نەوەشاندنە.

٥٤٠. بەردێك زانا بیخاتە ناو گۆم بە نەزانێ دەردێت، بەڵام بەردێك نەزان بیخاتە ناو گۆم، بە هەزار زانا دەرنایێت.

٥٤١. بەردێکی گەورە لە سەری دانێ.

٥٤٢. بەرچاوتەنگی رسوایی دێنێ.

٥٤٣. بەرگم پلاسە، هاودەمەکەم خاسە.

٥٤٤. بەرگو پلاس وێت، بەڵام لە دارایی دونیا ژنەکەت خاس وێت.

٥٤٥. بەرماڵی وەبان ئاوەوە ئەگەڕێ.

٥٤٦. بەر و پشتی بۆ نییە.

٥٤٧. بەر و دوای قسەی خۆی نازانێ.

٥٤٨. بەری رۆژ بە بێژنگ ناگیرێ.

٥٤٩. بەز نییە خۆی نییە، ناوی هەس.

٥٥٠. بەسمە، کوڕە کەچەڵ کەسمە.

٥٥١. بەش خۆم حەڵاڵ ئەکەم.

٥٥٢. بە چاو زیاتر لە گوێچکە متمانە بکە.

٥٥٣. بەچکە گەدا مەخە تەما، بە چڵێ کەما تێتە سەما.

٥٥٤. بەچکە گورگ هەر گورگە، ئەگەر لەگەڵ بنیامیشا گەورە بێت.

٥٥٥. بەچکە گورگم بۆ خۆم چاخ کردووە.

٥٥٦. بەعزێ ژن ئەیژن بمکەن سووزن ئاژن، بەو شەرتە پێم بێژن کوێخاژن.

٥٥٧. بەغا بە قنەخلیسکێ ناگیرێ.

٥٥٨. بەغا دوورە بۆ پیاوی فەقیر.

٥٥٩. بەغا نیوەی ڕێت بێ.

٥٦٠. بەفر جوانە و گەماڵ گوو ئەکاتە بانی.

٥٦١. بەفر لە خەوا، کفنە.

٥٦٢. بەفر نەواری، پای بزنیان ئەکردە دارا بەفر بوارێت.

٥٦٣. بەفر وەسە لەشکر.

٥٦٤. بەقای بۆ باوکیشی نییە.

٥٦٥. بەقایان نییە، ئەسپ و ژن و چەك.

٥٦٦. بەڵێ بەلاس، نەڵێ مەلاس.

٥٦٧. بەلا لە بووەن ئەکەوێتەوە.

٥٦٨. بەلەکە لە دەستم دەرچوو، سەر بە هەزارۆ بنێت.

٥٦٩. بەم ترەترە سووتە[1] ناگیرێت.

٥٧٠. بەم دەس ئەیدا و بەو دەس ئەیسێنێتەوە.

٥٧١. بەم شەکە شەکە ناگەیتە مەکە.

٥٧٢. بەنەخوێن حەرامم نەترازانە.

٥٧٣. بەنەخوێن خۆی ئەجاوێ.

٥٧٤. بەنی تۆم پێ با نادرێ.

---

١ـ ناوی گوندێکی سەر بەشاری سەقزە کە گوایە لە سەردەمی شای ئێراندا پاسگایەکی هەبووە و ئاغای ئەو ناوچەیە پیاوێك بووە بە ناوی حەمە سدێق خان جاف کە دەیویست ئەو گوندە لە دەس شای ئێران دەر بێنێ و بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. رۆژێك بڕیار ئەدا بە سوارە چەکدارەکانی ئەو گوندە رزگار بکەن. هەر لە سەرەتای هێرشەکەدا یەکێك لە سوارە چەکدارەکان لە ناکاو تڕێك ئەداتەوە. حەمە سدێق خان دەڵێ بەم ترەترە سووتە ناگیرێ و لە بڕیارەکەی پاشگەز دەبێتەوە.

٥٧٥. بەوبەختە مەکە بێوەختە.

٥٧٦. بەو دارە بە لەو مارە.

٥٧٧. بەو مەکێڵە، بەو دێتە رێگەت.

٥٧٨. بەومان نەدی، بەوترین لە یاد دەکەین.

٥٧٩. بەهارە، گەنمان وە تەغارە.

٥٨٠. بەین مەردی و نامەردی یەك قەدەمە.

٥٨١. بجیقێنیت و بفیقێنیت، پوولم داوە هەر ئەتخۆم.

٥٨٢. بخۆ ژار و بکێشە تاڵی، مەخۆ نانی خایەماڵی.

٥٨٣. بخۆ نان و ماست برۆ رێی راست.

٥٨٤. برۆ خوا نەچیرت با.

٥٨٥. برۆ لای کەسێ کە نەتناسێ، خۆت هەڵکێشە پڕ بە کراسێ.

٥٨٦. برا بووە برازا، کار لە کار ترازا.

٥٨٧. برا حەز وە مردن برا ناکا، حەز وە گولیی ئەکا.

٥٨٨. برا ساحێو تیر و کەوانە، خۆیشك ماتڵ خولك باوانە.

٥٨٩. برا لە پشت برا وێت، مەگەر قەزا لە لای خواوێت.

٥٩٠. برامان برایی، کیسەمان جیایی.

٥٩١. برا و براژن پاڵیان داوە، خۆیشك وە بێشوو سەری ناوە.

٥٩٢. برای خاسم هاوەلای گالەوە.

٥٩٣. برسی مەنێرە بۆ نان.

٥٩٤. برنگەیك و دوو نیشانە.

٥٩٥. بزمار دوودەم، هیچێك ناسمێت.

٥٩٦. بزن بە کەر ئەڵێ لەقە مەخە، خۆی شاخ تیژ ئەکا.

٥٩٧. بزن بترێ بەهاری خۆشە.

٥٩٨. بزن تا نەکۆکێ ناترێ.

٥٩٩. بزن پژمی ساڵێ خۆشە.

٦٠٠. بزن دوانزە مانگەی خوا قنی هاوە دەرو، وەلـێ مەڕ لە کەڵدنان باز با، ئەیژن قنو دەرکەوت.

٦٠١. بزن سم کۆڵان ئەکا و جێی خۆی خۆش ئەکا.

٦٠٢. بزن گەڕ گەلە گەڕ ئەکا.

٦٠٣. بزن عەنجەلی بێت، نان شوان دەخوا.

٦٠٤. بزن لە حەیوەت گیانی، قەساو لە حەیوەت چی.

٦٠٥. بزن و نێرەکەر ماڵ وێرانکەر، مەڕ و ماکەر ماڵ ئاواکەر.

٦٠٦. بزن وە سیانە، مەڕ وە دوانە، خوا بەرەکەت با لەم دریا و بانە.

٦٠٧. بزن و ولاخ لە خەوا شەیتانە.

٦٠٨. بزنی گەڕ لە چاوانە ئاو ئەخواتەوە.

٦٠٩. بسەن و بفرۆش دایکی پارەیە.

٦١٠. «بسم الله» لە سفرەی خاڵی ناکرێ.

٦١١. بچۆ بۆ بێگار، دامەنیشە بێکار.

٦١٢. بچێ و نەچێ لە باوکی ئەچێ.

٦١٣. بکێشە جەفا بوێنە سەفا.

٦١٤. بمرم ماڵ خاکم، بمێنم هین تۆ.

٦١٥. بمکوژە و رسوام مەکە.

٦١٦. بنیام بێعەقڵ، تڕ لە قنیا ئەوێتە نەقڵ.

٦١٧. بنیام بەتاڵ وەسە گۆزەی چەگیر[1].

٦١٨. بنیام برسی مەعدەی قەوچە ئەکا.

٦١٩. بنیام تەماحکار وە تەمای ئاومالّکە.

٦٢٠. بنیام تەناف خاتە مل خۆی باشترە لە لارەملی.

٦٢١. بنیام حیز دوو کراسی هەس، هەر دەمێ ئەیکاتە بەر کەسێ.

٦٢٢. بنیام حیز وەسە گۆزەی سوور هەر کالّەو ناوێت.

٦٢٣. بنیام خۆی دانگێکە و لیباس شەش دانگ.

٦٢٤. بنیام خوێڕی هەر وە ماڵ باوك خۆی فێرە.

٦٢٥. بنیام زۆر و ئینسان کەم.

٦٢٦. بنیام زیندوو وەکێڵ و وەسی ناوێت.

٦٢٧. بنیام گەوج لە هەر شوێنێکدا بێت شوێن خۆی گوم ناکا.

٦٢٨. بنیام گەوج وەسە کاوێژکەر.

٦٢٩. بنیام کەم لەش ئەوێت بێ بەش.

٦٣٠. بوخچەی پڕ، ئامونیای ماڵە.

٦٣١. بورج زەهرەمار، ناوێتە دڵدار.

٦٣٢. بوو بە تەوقی ئیزڕائیل لە ملم نابێتەوە.

٦٣٣. بوو بە خوێن سیاوەش هەر نابڕێتەوە[2].

٦٣٤. بوو بە کێچ و چووە کەوڵی.

---

١ـ مەبەست گۆزەیەکە کە ئاوی تیا ناوێسێ و ئاو سارد ناکاتەوە.

٢ـ سیاوەش ناوی یەکێ لە قارەمانەکانی کتێبی شانامەی فیردەوسی شاعێری بەناوبانگی ئێرانە. بە کوشتنی سیاوەش فیردەوسی زۆر شێعری بۆ هۆنیوەتەوە و کوشتنی ناوبراو زۆر دەنگدانەوەی هەبووە. ئێستە لە ئێراندا وا باوە هەر شتێك زۆر دەنگدانەوەی هەبێ و قسەی لێ بکەن، دەڵێن بووە بە خوێن سیاوەشەوە هەر نابڕێتەوە.

٦٣٥. بوو بە نەقڵ هێلکەوڕۆن بان بانجەکەو.

٦٣٦. بووە بە گوێزەکە لە سکما.

٦٣٧. بووەسە کەر دەروێش هەر سەعاتێ روو ئەکاتە ماڵێ.

٦٣٨. بووگە بە گسکە کۆتەرە.

٦٣٩. بووگە بە مڵۆزم گیانم.

٦٤٠. بووگە بە هەسارەی سوهەیل.

٦٤١. بووك لە سواری ئەگەڕێتەوە.

٦٤٢. بووك ماڵ میمکە هەیاسە، ساحێو شاپاڵ و لاسە.

٦٤٣. بووك نییەتی نانی شەوێ، ئەنگوستیلەی زێڕی ئەوێ.

٦٤٤. بووك و خەسوو نابن بە دوو.

٦٤٥. بووك هاتە ناو دالآن، خەسوو لە ژێرەوە ئەینالآن.

٦٤٦. بووکەکەی ماڵی مەتی، سەری سوورە و پای پەتی.

٦٤٧. بووکی پووران، کلۆژەی لای تەندووران، بووکی خالآن لەسەر هەرزالآن.

٦٤٨. بووکی مالآن چل مەن خوێ ئەخوات.

٦٤٩. بووکێك دەنگی دەلێر وێت، قسەی باوان و خەزووران وەك یەك نێر وێت.

٦٥٠. بووم بە چەقەنەی ئاشێ.

٦٥١. بووم بە چنگێ موو، دارایی باوکم ئەمدا بە شوو.

٦٥٢. بووم بە مانگی بن هەورێ.

٦٥٣. بویتە ئاور، دەور قن خۆت بۆ ناسووتێ.

٦٥٤. بوینە رەنگم، بپرسە ئەحواڵم.

٦٥٥. بوینین و تاریف بکەین.

٦٥٦. بێژە بە خاوەن بێستان، پاشگەزی ها لە زستان.

٦٥٧. بێژە قەوم دەمت گرد ئەبێتەوە، بێژە بێگانە دەمت بڵاو ئەبێتەوە.

٦٥٨. بێژنگ لا گەنم سیاهی دەرئەدا.

٦٥٩. بێژنگێ بگرە رووتا، تۆ چۆن من ئەوینی منیش وا تۆ ئەوینم.

٦٦٠. بێشکەی من تەمەرە جوانیگە.

٦٦١. بێگاری لە بێکاری خاسترە.

٦٦٢. بێگانە لە بەری دەر ئەکا، ئەیداتە پاڵ دەمی.

٦٦٣. بیگرە و بەری مەدە.

٦٦٤. بێڵەقوڕ بە دەستی خەڵکەوە سووکە.

٦٦٥. بینە بان چاو کوێرەوە، خۆشی ئەکاتەوە.

٦٦٦. بینە بەر خۆرەوە ئەچێتە رێگا.

٦٦٧. بێوەژن بە تەمای شووکردن نەبوو، کەچی داوای مارەیی هەشت یەکیشی ئەکرد.

٦٦٨. بێوەژن لە نیوەشەوا، پەشیمان ئەوێتەوە.

٦٦٩. بێوەژن وەسە پێسەی بووەن، ئەینیتە لای سەرییەوە، بۆی لێ تێ، ئەینیتە لای خوارەوە گەماڵ ئەیخوات.

٦٧٠. تۆ ئاوی ئەڕۆی، من زێخم ئەمێنمەوە.

٦٧١. تۆ باڵندەکان ئەکوژی جووجەڵەکان لە ناو هێلانەکان چی لێ ئەکەیت.

٦٧٢. تۆ بمرە کفن فرەس.

٦٧٣. تۆ کار نەکەی خوا لە بانجەو بۆت نانێرێت.

٦٧٤. تۆ کاڵەك خۆری یا بێسان ڕنی.

٦٧٥. تۆ لە ئاسیاوا وە زڕەی زەنگ، نە من دەنگ و نە تۆ دەنگ.

٦٧٦. تۆ مەکە خوا بیا، خوایش نەییات خۆ زۆر نییە.

٦٧٧. تۆ موویەك ئەوینی، من گلۆڵەموویەك.

٦٧٨. تۆ وەقەو ئاشەوانەکەی لێ ئەزانی.

٦٧٩. تۆ های ئەکەی، من هوو ئەکەم، تۆ ژن تێری من شوو ئەکەم.

٦٨٠. تۆپین کەر، زەماوەن گوری.

٦٨١. تۆخڵە پیاز بسووتێنی، قەرزار دەبی.

٦٨٢. تا ئەتوانی کەس لە خۆت مەڕەنجێنە.

٦٨٣. تا ئەجەلی نەگەییێت، نامرێ.

٦٨٤. تا ئەمەوت بە چەپڵەڕێزان، شاییم ئەگێڕا عەرزم ئەلەرزان.

٦٨٥. تا ئەیژێ سێف، شێڵانە پێ ئەگەیێ.

٦٨٦. تا ئەیژێ قۆرە، هەنگوور پێ ئەگەیێ.

٦٨٧. تا ئیزرائیل نەیێت بۆ لات، قەور دنیا نازانیت.

٦٨٨. تا بە شەو نەڕۆیت، رۆژ ناوێتەوە.

٦٨٩. تا تەنوورەکە گەرمە نانێکی پێوە بە.

٦٩٠. تا پیرێ نەوێ، کەمتاقەت نەوێ، یا حاڵێت ئەکەم یا حاڵی ناوێ.

٦٩١. تا پیرێك بمرێ هەزار جوان ئەمرێ.

٦٩٢. تا خۆت تەجروبەی نەکەی ژن مەهێنە، نان و گوزەرانی ئەوێت.

٦٩٣. تا خان بخازێ، لەشکر ئەترازێ.

٦٩٤. تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت.

٦٩٥. تا خنجێر لە کێلانیا نەوێ، باوەڕو نەوێت.

٦٩٦. تا خوا سەری داوە، رۆزیش ئەدا.

٦٩٧. تا دادە نەکا بۆرەبۆرە، کاکە ناکا زۆرەزۆرە.

٦٩٨. تا دار نەرمە، ئەشێ بچەمێتەوە.

٦٩٩. تا دەس نەچێتە لاس، دەم ناچێتە ماس.

٧٠٠. تا دەوڵەمەنە چواردەوری پڕە، باوك بێ برا و ئامۆزای فرە.

٧٠١. تا دووری سێوی سووری، تا نزیکی مامرە زۆڵی.

٧٠٢. تا دوێکەو، ناوە زێڵەکەی نەئەخوارد، ئیمڕۆ گان ئەدا بۆ تۆخەکەی.

٧٠٣. تا دیانم بوو نان نەبوو، ئێستە نانم هەیە دیانم نییە.

٧٠٤. تا ژیام کەوش نەو لە پاما، ئیسە مردم دووان ها لە جاما.

٧٠٥. تا ژیر بووم پیر بووم.

٧٠٦. تا ژیر بیری کردەوە، شێت دوو منالی بوو.

٧٠٧. تا زۆر وێساوێ، قەواڵە بەتاڵە.

٧٠٨. تا زۆرت بێت، سەرت جەنجاڵە.

٧٠٩. تا زمان هەس، زۆرمان نییە.

٧١٠. تا چەرمەکە سەگ نەیخواردە کارێ بکە.

٧١١. تا گا وە دەنگت ئەکا قسە بکە.

٧١٢. تا گەنم نەوەشێنی، خەرمان هەڵناگری.

٧١٣. تا عاقڵ بیری کردەوە، شێت دەسی خۆی وەشاند.

٧١٤. تا عاقڵەکان رێگایەك بۆ پێکەنین پەیا ئەکەن، شێتەکان بیست جار پێ ئەکەنن.

٧١٥. تا عالەمێك هەس، ئادەمێك هەس.

٧١٦. تا فەرز وێساوێ، سوننەت بەتاڵە.

٧١٧. تا کەنیشکی ئەمیری، شوت کرد گزیری، زکت کرد پیری.

٧١٨. تا مازوو نەوێت گۆروازی ناکرێت.

٧١٩. تا مانگا بەرەڵا بێت، کەڵەگا جەژنیە.

٧٢٠. تا مەلە نەکەی نازانی مەلە چۆنە.

٧٢١. تا مردنە، هەر کردنە.

٧٢٢. تا نەخۆی گەن و گوو، هەڵ نایێری رەنگ و روو.

٧٢٣. تا نەگریێ تەوەق، ناڵێ: «الله صدق».

٧٢٤. تا نەکێشی نەفەس ناچیتە قەفەس.

٧٢٥. تا نەوینی زەوەرەی زمسان، ناوینی بەهرەی باغ و بێستان.

٧٢٦. تا وە شەو نەڕۆی بە رۆژ ناگەیتە مەنزڵ.

٧٢٧. تا وەختێ ئەمتوانی بخۆم نەمبوو، ئێستە کە هەسم ناتوانم بخۆم.

٧٢٨. تا های لەبەر چاوا، های لە دڵا.

٧٢٩. تاج تەلا وە بان سەرتەوە بێت، لە برسیا ئەمری.

٧٣٠. تاریف دایك لە کەنیشك بۆ بەری بەشە.

٧٣١. تاریفکردن نەخۆشییە و رەخنە دەرمانە.

٧٣٢. تاریکی ماڵ سەر لە ئێوارە دیارە.

٧٣٣. تازە من تەقەڵ قنم دڕیا تۆ هۆش خۆتت بێت.

٧٣٤. تاقانە یا شێتە یا دێوانە.

٧٣٥. تا کەلـێ نەرمێ، کەڵەنان پڕ ناویت.

٧٣٦. تالان کریاو ئەوەی لە دز ماوەتەوە، ئەیدا بە فالگیر دزی بۆ پەیا بکا.

٧٣٧. تالان کریاو، زوو ئەبێتەوە بە ماڵ.

٧٣٨. تالی تەماکۆ باشترە لە بنیام بەدخوو.

.٧٣٩ تاڵی کا زوانە، خۆشی کا زوانە.

.٧٤٠ تانەی خەڵك لە گۆڕەوشاری قەور خراوترە.

.٧٤١ تانەی دۆس لە تیری دوژمن خراپترە.

.٧٤٢ تانجی بەگزادەی سەگە.

.٧٤٣ تانجی خێرا بەشی لە مەنجەڵی بە گۆڵ دەدڕێنێ.

.٧٤٤ تانجی قۆچاخ خۆی نان خۆی دەر تێرێ.

.٧٤٥ تانجی لە نەچیری نەئەکرد ئەیوت بێگۆشتە.

.٧٤٦ تانجی من کەروێشکی تۆ ناگرێ.

.٧٤٧ تانجیە زەردە ئەکەمە سەر راو، رۆن کەڵەشای خواردە ئەیکەمە زووخاو.

.٧٤٨ تاوان‌دار ها وەلای یارەوە، بێتاوان پای هاوە دارەوە.

.٧٤٩ تاوسان ئەخەفێ خەرامان و مەس، زمسان ئەگەڕێ سەوەتە وە دەس.

.٧٥٠ تایفە وەسە جەنگەڵ، هەچی چتە تیا هەڵئەکەوێ.

.٧٥١ تەپاڵەی تەڕ ئاور ناگرێت.

.٧٥٢ تەپەی تایەکەت، سەروێنی لارە.

.٧٥٣ تەختە باری نەوێت، قەوزەی نییە.

.٧٥٤ تەرەقی و تەنەزول بە خوایە.

.٧٥٥ تەرزە نییە بارانە، هەر ترنەکەی جارانە.

.٧٥٦ تەڕ و وشك بە یەکەوە ناسووتێ.

.٧٥٧ تەریو لەسەر قەورستان بسوتێنی، دەڵێن بالووکە وشك دەبێ.

.٧٥٨ تەشەر چ لە خۆم چ لە کۆیانم.

.٧٥٩ تەشی رفێق ڕاس، تەون پاپێچ پاس.

٧٦٠. تەشی ڕێس، تەشی ڕێس وێت وە کلکی کەریش ئەیرێسێ.

٧٦١. تەقەی سەری تێ.

٧٦٢. تەقیلە لەسەر پیاو دائەکەوێ.

٧٦٣. تەڵاق پیاو لە لایەك، تڕ بزن لە لایەك.

٧٦٤. تەڵای خۆت دەرکە و تیتاڵی بە ئەشرەفی خەڵك کە.

٧٦٥. تەلەفوون هاتە ماڵمان، شەڕ کەوتە ماڵمان.

٧٦٦. تەماتە نێر و مێی ماسی وەمن تاقی بکەیتەوە.

٧٦٧. تەماح سەری نەخۆیت سەرت ئەخوا.

٧٦٨. تەماح ها لە ئەولای ئەڕواحەوە.

٧٦٩. تەماحکار دوو جار ئەخەڵەتێ.

٧٧٠. تەماحکار هەمیشە موحتاجە.

٧٧١. تەمەڵ خۆشبەخت نابێت.

٧٧٢. تەمەڵ غەیبزانە.

٧٧٣. تەمەڵی برای سواڵکەرییە.

٧٧٤. تەنگی و تورشی چێشت کەوچکێکە.

٧٧٥. تەنوور سەری نەوێت ئاوری فرەس.

٧٧٦. تەنوور لە خەوا قەورە.

٧٧٧. تۆبە پشتیوانی گومڕاهانە، قورئان و فاتێحە سەرمایەی سواڵکەرانە.

٧٧٨. تەور تیژ، زوو کول ئەوێت.

٧٧٩. تەور دەسك خۆی نابڕێتەوە.

٧٨٠. تەون بچێتە دار هەر تێتە خوار.

٧٨١. تەویر شەو، ئاوایی رۆژە.

٧٨٢. تەویر مەکە، ئەویتە هەویر.

٧٨٣. تەوێڵە گەورە و بیچکی بۆ نییە، تەماحی فرەس.

٧٨٤. تەویلە وە زستانا دەزورانی فرەس.

٧٨٥. تڕ بە رەشکەوە ناوێسێ.

٧٨٦. تڕ بەرەو خەڵك لە دەورت ئەپەڕێتەوە.

٧٨٧. تڕ زل لیدان قوون دڕینی هاپێوە.

٧٨٨. تڕ کەر سوڕنا لێدانە.

٧٨٩. تڕ وە کۆکە جوبران ناوێتەوە.

٧٩٠. تڕێ بەرەو با سەرت سووك بوێت.

٧٩١. تڕێ بەمەو با ئەتوا.

٧٩٢. تڕێ بریا، کاڵەك خوریا، رووڕەشی بە باخەوان بڕیا.

٧٩٣. تڕێ چاو لە تڕێ دەبڕێ، ئاو ئەزێتە دەمی.

٧٩٤. تڕەکەی تڕ نییە، جەواڵدڕە.

٧٩٥. تڕتم بڕی.

٧٩٦. ترپ ئەنێتە جێی چۆنەر.

٧٩٧. ترپی خواردووە تسی گەڕانوەتەوە.

٧٩٨. ترس زیندانی دڵە.

٧٩٩. ترشکە لە خۆی دووشکە.

٨٠٠. ترِی گۆزەڵە ئەشکێنێ.

٨٠١. ترِی لـێ ئەدا، باوکیشی لی نەداوە.

٨٠٢. ترِی وە پیبک ناشکێ.

٨٠٣. ترِین کار کەرە، فرِین کار مەلە.

٨٠٤. تف بەر با ریش ئەگرێتەوە.

٨٠٥. تف بخە بۆ ئاسمان دێتەوە بۆ ناو چاوان.

٨٠٦. تف هەڵخەم خۆم ئەگرێتەوە.

٨٠٧. تفەنگ ئەزانێ قۆناخ ها لە کوێ.

٨٠٨. تفەنگ ئەو تفەنگەسە، دزی پێ بکوژێ.

٨٠٩. تکەتکەی ئاو بەرد کون ئەکات.

٨١٠. تماشای خۆت مەکە، پشت یاڵەکە بوینە.

٨١١. تماشای کە ئەیژی گای سەروەشێنە.

٨١٢. تماشای کە ئەیژی مووی هەڵئەکزێنی.

٨١٣. تماشای لە خۆت خوارتر کە.

٨١٤. تماشای نۆکەر کە و پاوشا بناسە.

٨١٥. تمەنێکم نییە بیەمە شێلانە، قەومەکان ئەیژن ژنێك بێرانە.

٨١٦. تورك تا دۆشاوەکەی نەرِژێ، نایکا وە خێر ئیمام حسەین.

٨١٧. تون مەرِۆ پات هەڵئەکەفێ، ناوکت ئەکەفێ، ئارەق بیدمشکت دەس ناکەفێ.

٨١٨. تونی تەماکۆ، تورشی تەماتە، بەقای زاوا هەر یەك سەعاتە.

٨١٩. توو لە بنەتوو هەڵئەگیرێ.

٨٢٠. تووکم سنگ سنگ وێسا.

٨٢١. توول تەرِ، توولەوان تەرِ، ناڵەی شەرِ، حەیای کەر.

٨٢٢. توول پاك‌کەر، برای سەوەتەچنە.

٨٢٣. توول وە توولی ئەچەمێ وە داری ناچەمێ.

٨٢٤. تیر ئەخا کەوان ئەشارێتەوە.

٨٢٥. تێر ئەخوا، تێتە سەما.

٨٢٦. تێر خەوەری نییە لە برسی.

٨٢٧. تیر لە کەمان دەرچوو، ناگەڕێتەوە.

٨٢٨. تێر نەخواردن لە باوکمردن خراوترە.

٨٢٩. تێگەیشتن لە پلاوخواردن خۆشترە.

٨٣٠. تیکە بیجاوە، ئینجا قووتی بە.

٨٣١. تیکە لە دەم داکەوێ بۆ باوش باشە.

٨٣٢. تیکەی زل هەم دەم ئەدڕێ هەم قنگ.

٨٣٣. تیکەی کەمتر، برای زۆرتر.

٨٣٤. تیکەیێ بگرە دەمو نەدڕێ.

٨٣٥. پۆس سەو بە دەواخی پاکەو ناوێت.

٨٣٦. پا ئەدا لە پەیین.

٨٣٧. پا دارەکان بگرە بێ پا ماڵ وێمە.

٨٣٨. پا مەکە ناو کەوش خەڵکا.

٨٣٩. پات هاوە لێو قەورەوە.

٨٤٠. پادار لە شوێن بێپا ناوێسێ.

٨٤١. پارە نۆکەری ئینسانی زانایە، ئەربابی ئینسانی نەفامە.

٨٤٢. پارەکە دۆس ئەمساڵ ئاشنا.

٨٤٣. پاشە بەرە، ئابڕوو بەرە.

٨٤٤. پاشقولم مەدە.

٨٤٥. پاکم بۆیە بێ باکم.

٨٤٦. پاکوت دەس خۆیی، شەو و رۆژ ئاوری لێ هەڵئەسێ.

٨٤٧. پاوشا فاتێحاخوێنی فرەترە تا زەماونگێڕی.

٨٤٨. پای بەر و دوای نییە.

٨٤٩. پای پەتیم خاسە نەك لاپاڵی تەنگ، یانەی چۆڵ خاسە تا ماڵ پڕ جەنگ.

٨٥٠. پای پێچیاسە ریخۆڵەی خۆیا.

٨٥١. پای زل بێوڵەتە، سەری زل دەوڵەتە.

٨٥٢. پای زل و دەس زل، خەجاڵەتی تێرێ.

٨٥٣. پاییز پڕ بیپژێنە و بەهار تەنك.

٨٥٤. پاییزی گەرم، مایەی ماڵگەرمییە.

٨٥٥. پەتاتە، شەلەم دەواتە.

٨٥٦. پەتك چی، لەتك چی، بتوەم هەتا ئایخچی[1]، بتدەم بەدەس تفەنگچی.

٨٥٧. پەز، ئەیژێ خۆزیا ئەمیانبڕیەوە، ساحێو ماڵ دوو حەفتە نەمیدیایێ.

٨٥٨. پەل لە تاریکی ئەکوتێ.

٨٥٩. پڕ ماڵیانە لە رازیانە، خۆی وە دڵێیشان ئەمرێ.

٨٦٠. پردی دز و نامەرد زوو دەڕووخێت.

٨٦١. پرزەی خۆی ئات و لە ناو ئاوایی.

٨٦٢. پرس بە ژن بکە و بە قەولی مەکە.

٨٦٣. پرسییان: خەڵك کوێی؟ وتی هێشتا ژنم نەهاوردە.

---

١ـ ناوی گوندێکی سەر بەشاری سەقزە.

٨٦٤. پرسین عەیب نییە، نەزانین عەیبە.

٨٦٥. پشت راسەو ناکا.

٨٦٦. پشی ئەیکرد نیسکێ گوو، ئەیدا ملیا خۆڵی بێسامان.

٨٦٧. پشی بۆ خۆی گوو ئەکات و چاو لە مەردم زاق ئەکاتەوە.

٨٦٨. پشی رەش نیشانەی جنۆکەس.

٨٦٩. پشی سمێڵی بکەی ناتوانێ وەبان دیوارەو بڕوا.

٨٧٠. پشی میاومیاو ئەکا، داوای گۆشت برژاو ئەکا.

٨٧١. پشی وەخت سەر خوارننی نییە.

٨٧٢. پشیلە ئەیژێ لە ماڵێکا وم، تەنیا پیرەژنێکی تیاوێ.

٨٧٣. پشیلە باڵی بوایێ، تووی چۆلەکەی ئەبڕی.

٨٧٤. پشیلە بچێتە ژێر قورسی سارد دەبێت.

٨٧٥. پشیلە دەم و چاوی بشۆرێ مێوانمان دێ.

٨٧٦. پشیلە دەمی بە دووگ نەئەگەیێ ئەڵێ سۆڵە.

٨٧٧. پشیلە لە خەوا نەوسە.

٨٧٨. پشیلە لە عان کوێری و کەڕیا لە دوای مشك ئەگەڕێ.

٨٧٩. پشیلە وەختێك نان لە بەری دەهاوێن چاو دەقونجێنێ.

٨٨٠. پلەپلە ئەشێ بچیتە بان.

٨٨١. پووڵ بخە قن مردی، ئەیخەیتە جوڵەجوڵ.

٨٨٢. پووڵ بدە مەلا لە مزگەوت دەر بکە.

٨٨٣. پووڵ بدە مەلا وەك لۆتی سەما ئەکا.

٨٨٤. پووڵ پووڵدار پەیا ئەکا.

٨٨٥. پووڵ و ماڵ حەرام، وەسە کەنیشك مارە بڕیاو لە ماڵ باوکیا.

٨٨٦. پووڵ هاتە گۆڕێ زۆر شت دەگۆڕێ، تەنانەت دۆستی گیانیش دەدۆڕێ.

٨٨٧. پووڵ ئەوێتەوە، دۆس ناوێتەوە.

٨٨٨. پووڵ بە خەرج نەکردن کۆ دەبێتەوە.

٨٨٩. پووڵ بدۆزیتەوە ئەبێ بیژمێری.

٨٩٠. پووڵ پەیاکردن ئاسانە خەرجکردنی گرانە.

٨٩١. پووڵ پەیداکردن هونەر نییە، خەرجکردنی هونەرە.

٨٩٢. پووڵ خۆ لە ئاو هەڵناگۆزێت.

٨٩٣. پووڵ دەوای کارە.

٨٩٤. پووڵ مەردم گیرفان کون ئەکا.

٨٩٥. پووڵ مفت ئەگەر کەوتە دەستت وەك ئەوە وایە لە کولانجەوە کەوتبێتە خوارەوە، قەوری نییە.

٨٩٦. پووڵدار کەباب ئەخوات و بێپووڵ دووکەڵەکەی.

٨٩٧. پووڵدارەکان پووڵیان هەیە، فەقیرەکان منداڵیان هەیە.

٨٩٨. پیاز لە جێی تیژە و کوڕخاس لە ژن حیزە.

٨٩٩. پیازێکی کەند و ترپێکی خستە جێی.

٩٠٠. پیاو ئامەوی وێت دوژمنەکەی عاقڵە.

٩٠١. پیاو ئەگەر زیرەك بێت، ماڵ ها لە باهۆی میردا.

٩٠٢. پیاو ئەو پیاوە نییە هین ئەم دونیا بێ، پیاو ئەو پیاوە نییە هی ئەو دونیا بێ، پیاو ئەو پیاوەیە هین هەر دوو دونیا بێ.

٩٠٣. پیاو ئەو پیاوەسە ئەوەڵ شەو بیدڕێ.

٩٠٤. پیاو بە بێ‌کەس هەژار ئەبێت، ژن بە بێ‌پیاو هار ئەبێت.

٩٠٥. پیاوی دز، دزی وەکاری خراو نازانێ، مەگەر ئەو وەختە لە خۆی دزی بکەن.

٩٠٦. پیاو دوو عومری لازمە، لە یەکیاندا تەجروبە خڕ بکاتەوە، لەوی دیکەدا تەجروبە بەکار بێنێ.

٩٠٧. پیاو ژندار هەر لە خەتەنەچی ئەترسێ.

٩٠٨. پیاو زۆڵ وە چاویا ئەیناسی.

٩٠٩. پیاو سیروانە، ژن بەریانە.

٩١٠. پیاو گەڕ و گول هەمیشە کزە، تەقەی دریا تێ وا ئەزانێ دزە.

٩١١. پیاو گەوج وە سێوەر خۆیا ئەنازێ.

٩١٢. پیاو قن کا لە تەنوور، ئەشێ لە پای گەرماکەیشا بوێسێ.

٩١٣. پیاو قین کا لە بەنەخوێنەکەی، مێز ئەکاتە خۆیا.

٩١٤. پیاو ناتوانێ بیکا، داوای تف ئەکا.

٩١٥. پیاو وەك چەقۆیە و ژن وەك هەسان.

٩١٦. پیاو هەڵگەڕێتەوە.

٩١٧. پیاو، پیاو وێت، برۆ ناگرێ.

٩١٨. پیاوێ ژنی جوان بێ هەمیشە کزە، خشەی مشك دێ وا ئەزانێ دزە.

٩١٩. پیاوێ پیاو وێت ماڵی بۆ چییە، پیاوێ ناپیاو وێت ماڵی بۆ چییە.

٩٢٠. پیاوی خۆش باوەڕ هێندە فەقیرە، وە دەس ژنەوە هەمیشە ئەسیرە.

٩٢١. پیاوی دوشمن‌دار لە سێوەر خۆی ئەترسێ.

٩٢٢. پیاوی دوو ژنە، جەرگی کون کونە.

٩٢٣. پیاوی چکۆلە ساڵی سێ جار لە خوا یاخی ئەبێ.

٩٢٤. پیاوی گول لە خۆی رازیە.

٩٢٥. پیر و خڕە بی.

٩٢٦. پیرەژن ئەیژێ: خۆزیا گشت شتێ دەسگەل وابێت، نان خواردن دەسگەل نەوابێت.

٩٢٧. پیرەژن بیوەیتە تەخت پاوشایی، ئەیژێ سڕ خۆم و تڕ خۆم.

٩٢٨. پیرەژن وە فێڵ رەوی کردە کون.

٩٢٩. پیرەژن وتی با وە دەسەجەمعی بیکەین وەلێ وە تەنیا بیخۆین.

٩٣٠. پیرێ بوینە و پەندێ هەڵبگرە.

٩٣١. پیری تاجی تەپاڵەس، جوانی تاجی گوڵاڵەس.

٩٣٢. پیری شەرمی لە کەس نییە.

٩٣٣. پیری هاتووە وە پیریمەوە، پاڵی دا وە لای فەقیریمەوە.

٩٣٤. پیری هاوسەفەرێکی خراوە.

٩٣٥. پیرێکم دیە گەلێ دوڕشناسە، حەیفە پیر بووە و بۆ مردن خاسە.

٩٣٦. پیری و هەزار عەیب.

٩٣٧. پیسی لەش زوو پاك ئەوێتەوە، پیسی رۆح پاك ناوێتەوە.

٩٣٨. پێشە وتی لە کوێیت، وتی کەفتمە دەم سەوێ لە تۆ سەوتر.

٩٣٩. پێچ پێچە وەك شاخەی نێری، یاخوا کەس نەکەوێتە ژێری.

٩٤٠. پێغەمبەر ئەناسێ خوا ناناسێ.

٩٤١. پێکەنین ناوەخت ئاخری هەر گریانە.

٩٤٢. پێکەنینی زۆر دڵ ئەمرێنێ.

٩٤٣. پێم خۆشە سەرم وە بن گڵ کەوێ، نەك بە لالووتەوە بڵێن چیت دەوێ.

٩٤٤. پێوەداین لە ویزەویزە خۆشترە.

٩٤٥. جۆ ئەیژێ عەجایەب ئەمێنم ئەمکەنە ناو کەنوو، کەنوو ناتەقێ.

٩٤٦. جۆ بکێڵی، گەنم سەوز ناوێت.

٩٤٧. جۆدز وە جۆکێڵی ناگەیێنێ.

٩٤٨. جۆدز چی دەکا لە جۆکاڵە.

٩٤٩. جۆگەلە دەریا لێڵ ناکا.

٩٥٠. جا ئاوی بۆ من نییە بۆ تۆ خۆ نانی هەس.

٩٥١. جا وەرە ئەم کەرە بێنە ئەم تەڕەتووە بار کە.

٩٥٢. جامێ گۆشت لە هەزار شایەد و بایەد باشترە.

٩٥٣. جامێك هەڵگرە خۆتی چۆن تیا ئەوینی، منیشی وەها تیا بوینە.

٩٥٤. جاهێڵ مەنێرە بۆ تماشای ژن.

٩٥٥. جەخت خاسە، سەور دەڵێ سەور کە مەڕۆ.

٩٥٦. جەماڵی هەس و کەماڵی نییە.

٩٥٧. جەمتان جەمە هەر منتان کەمە.

٩٥٨. جەواهێر بڕژێ وە دامانەوە، قەوری نییە وەلای نادانەوە.

٩٥٩. جل تەقەڵی تیا نەوێت گەورەتر ئەوێتەوە.

٩٦٠. جل رەنگی لە رەنگ کەر نەچێ، کەر ناچێتە رێوە.

٩٦١. جل لە دیوەخان، شانەیش لە تەلیس.

٩٦٢. جل لە لای پاوشا حورمەتی فرەس.

٩٦٣. جلم تەڕ کرد لەو رەویە لەڕە.

٩٦٤. جن پەراسوویەکی لە ئۆمەت موحەممەد زیاترە.

٩٦٥. جوان بەرد ئەتاوێنێتەوە.

٩٦٦. جوان دانیشێ بە لای پیرەوە وەسە زیندانی بە زنجیرەوە.

٩٦٧. جوان لە جوانیا ئەمرێ بەڵام پیر بی، ئەشێ هەر بمری.

٩٦٨. جوانترین ئارایش زەردەخەنەیە.

٩٦٩. جوانترین گوڵ لە رەشترین زەویدا ئەڕوێت.

٩٧٠. جوانی ناوماڵ، شەونشینە.

٩٧١. جوانی ها لە بان پێسا وەلێ خراوی تا بان پێشە ئەڕوا.

٩٧٢. جوانییەکەت هەس و تورکییەکەیش ئەزانی.

٩٧٣. جواو بووەن بۆ میران، کارەکەر، کارەکەی گیران.

٩٧٤. جواو زۆر، زۆرە.

٩٧٥. جووجەڵەی ساوا، ئاخر پاییز حەساوە.

٩٧٦. جووچکەترسێن کراوە.

٩٧٧. جوێن شێت و منداڵ وەك فاتێحا وایە.

٩٧٨. جێی کوتەك خۆش ئەوێتەوە، جێی قسە رەش ئەوێتەوە.

٩٧٩. جێگایێ بگرە بۆ دانیشتن، هەڵتنەسێنن.

٩٨٠. جێگەی گەرمە بۆیە قسەی خۆش ئەکا.

٩٨١. جێگەی مشت پالەقەیە.

٩٨٢. جێی ماڵێن ماڵێن، جێی ناڵێن ناڵێن.

٩٨٣. جێیەك بۆ خۆم، جێیەك بۆ کەرەکەم.

٩٨٤. حازرخۆر و قەراخنشین.

٩٨٥. حازرخۆری بەر سێبەر.

٩٨٦. حاشا لە دیارت.

٩٨٧. حاشا لە ماڵ گەن کەس نایژێ بە چەن.

٩٨٨. حاشا لەو بەشە خوا نەیدا.

٩٨٩. حاشا لەو خوێنە شەو هات بە سەریا.

٩٩٠. حاشا لەو رۆژە گورگ ببێ بە شوان.

٩٩١. حاشا لەو شتە، قەراری نەکەی.

٩٩٢. حاکم نەخۆشە، نۆکەر ئەپژمێ.

٩٩٣. حاڵێکردنی هەندێ کەس بە زەربی شەق و لەقەس.

٩٩٤. حەرام بۆ حەرام، حەڵاڵ بۆ حەڵاڵ.

٩٩٥. حەزرەت ئادەم وەختی حەزرەت حەوای ئەخوازی، بیست و یەك زك ئەکا، بیستی دوانە ئەوێت، مایەکەی بەکانە ئەوێت.

٩٩٦. حەزرەت مووسا بۆ تۆ چووە کێف توور.

٩٩٧. حەزم لە چەو کرد لە هەڵەهەڵەت، لە سەوای بێ پووڵ، داچەکەی باخەڵت.

٩٩٨. حەساو لە من گیرفان لە تۆ.

٩٩٩. حەسەنباوك تەقە بە لە ناوك.

١٠٠٠. حەفتت خوارد وەنازەوە، حەفتت خوارد وەپیازەوە، حەفتت خوارد وە شیر مانگازەردەوە.

١٠٠١. حەفت کفنی زەرد کرد.

١٠٠٢. حەق بالاترە لە قانوون و یاسا.

١٠٠٣. حەق بە حەقدار ئەگەیێت.

١٠٠٤. حەق مەکە ناحەق.

١٠٠٥. حەقیار، حەق ئەکاتەوە.

١٠٠٦. حەڵاڵزادە لە خاڵۆی ئەچێ.

١٠٠٧. حەمە چاییەکە دەمە.

١٠٠٨. هەوڵی نان بدە شووتی هەر ئاوە.

١٠٠٩. حەیا لەم وڵاتە باری کردە.

١٠١٠. حەیا نەما حورمەت نەما، ئەویشە مەنەن چوو بۆ بەنەن.

١٠١١. حەیا یەك تکە بڕژێ کۆ نابێتەوە.

١٠١٢. حەیایار لە حەیای خۆی ئەترسێ، بێحەیا ئەیژێ لە من ئەترسێ.

١٠١٣. حەییە عەلا کوولکە، کوولکەخواردن کوڕی هەرەکە.

١٠١٤. حەیوان بە قاچیەوە ئەبەسنەوە، ئینسان بە قەولیەوە.

١٠١٥. حەیوان بناڵێ، مانی شوان دەرئەچێ.

١٠١٦. حورمەت هەر کەس ها وە خۆیەوە.

١٠١٧. حوکم مناڵ لە حوکم شا رەواجی فرەترە.

١٠١٨. حیز بە خاڵۆی خۆی فێرە.

١٠١٩. حیز دێکەی خۆت، لە ماچ کریاو لایەل باشترە.

١٠٢٠. خوای گزە نایدا بە دزە.

١٠٢١. خوار دانیشە، بەڵام راست بێژە.

١٠٢٢. خۆ دنیا هەر ئەمڕۆ نییە.

١٠٢٣. خۆ گاسوور نیت تا ئەمریت لە پێس خۆتا بیت.

١٠٢٤. خۆ گوێزت بۆ ناژمێرم.

١٠٢٥. خۆ مەشکە رەنگ ناکەی.

١٠٢٦. خۆ مەغز بامم نەخواردە.

١٠٢٧. خۆ نانم وە بان ساجەوە نەسووتاوە.

١٠٢٨. خۆت بۆ خۆم کچت بۆ کوڕم، جیکەو بێت جیکەو ئەبڕم.

١٠٢٩. خۆتی بۆ شل مەکە.

١٠٣٠. خۆخۆر مەوە.

١٠٣١. خۆر تا هەڵنەیەت، نادرەوشێتەوە.

١٠٣٢. خۆر پا بنێتە هەر جێگایەك دوکتور پای تێ نانێ.

١٠٣٣. خۆراك وشتر دەخوات، هێلکەی مریشك دەکات.

١٠٣٤. خۆزەم بەوە وجاخی کوێرە.

١٠٣٥. خۆزگا لەم دونیا سێ شت نەبوایە، پیری، ڕەجاڵی، مردن نەبوایە.

١٠٣٦. خۆزگە بەو کەسە بۆ خۆی مردووە لە هاوڕێی کەر نەجاتی بووە.

١٠٣٧. خۆزیا بچوایەمە شارێك، پیرەژنێ کوێر قەومم بوایێت.

١٠٣٨. خۆشبەخت کەسێکە رووی حاکم و حەکیم نەوینێت.

١٠٣٩. خۆشەویستی منداڵ ها بە دایکیەوە.

١٠٤٠. خۆشیخۆشی نۆکەر خانم، چڵم هەڵقوڕێنێ دوای هەتیوانم.

١٠٤١. خۆشی خۆشیمە، خلە خێر ئەکا، ئەو کەسە خێر ئەکا کە خلە تێر ئەکا.

١٠٤٢. خۆشی خۆشیمە، زارام دا وە شوو، پاو پێڵەی زارا کەرەکولێش گوم بوو.

١٠٤٣. خۆشی شەو، خەجاڵەتی رۆژە.

١٠٤٤. خۆشی لە خۆشامایی خۆی نەئەهات.

١٠٤٥. خۆشی لە خۆم خۆشاو ئەخۆم، هەرکە بمرێ پڵاو ئەخۆم.

١٠٤٦. خۆڵ ئەکەیتە سەر خۆتا، بچۆ لە خۆڵەکەوان گەورە، بیکە سەر خۆتا.

١٠٤٧. خۆم قەرە، پۆشین قەرە، مەسخەرە هەی مەسخەرە.

١٠٤٨. خۆی ئەزانێ بەچکەی لە کوێدا گوری خواردیە.

١٠٤٩. خۆی ئەیوڕێ، خۆیشی ئەیدوورنێ.

١٠٥٠. خۆی ریشی نییە بە کۆسە پێدەکەنێ.

١٠٥١. خوێ لە خوانە، دۆ لە دەوانە.

١٠٥٢. خۆی لووتی زلە، ئەگەیشتە هەر کەس تفی ئەکرد لە لووتی.

١٠٥٣. خاس و خراو وە دەس خواس.

١٠٥٤. خاسە ئاگر، خاسە دۆ، خاسە نەوەك شوو.

١٠٥٥. خاسێ پێیان نەئەدا پیازێ، دووان دووان ئەخوازێ.

١٠٥٦. خاسی و خراوی بە دوو نەفەر ئەکرێێت.

١٠٥٧. خاك خەیانەت وە ئامانەت ناکا.

١٠٥٨. خاڵۆ ئەسپ نەسەنیاو، ئاخوڕ هەڵواسیاو خەیاڵپڵاوە.

١٠٥٩. خاڵۆ خاڵۆی منە، خەرج خانان ئەدا.

١٠٦٠. خاڵۆ دانیشتوو، زەم خاڵۆژنی ئەکرد، ئەو لەو زیاتر خۆی وشکەڕن ئەکرد.

١٠٦١. خان خا رابێعا[1].

١٠٦٢. خان لە خانم ئەوێتەوە.

١٠٦٣. خانەداری، لە خانەی مەردم خەوەر داری.

١٠٦٤. خەتەنەکردن فەرزە نە لە بنا.

١٠٦٥. خەرمانە گەورەی لە برسیا مردوو.

١٠٦٦. خەریك کێرە خۆڵێس.

---

١ـ ماڵی ئافرەتێك بووە لە شاری سەقز کە لە رابردوودا هەرکەس بهاتایەت بۆ شار، وڵاخ و هێسرەکەی لە ماڵی ئەواندا دەبەستەوە. هەر ئەمە بووەتە هۆی سەرقاڵی ماڵی ئەو ئافرەتە. هەر بۆیە دواتر ماڵی هەر کەسێك هامشۆوڕەفتی زۆر بوایە دەیانگوت بوەسە خان خا رابێعاوە.

١٠٦٧. خەریکم وەك فیشەك ئەچمە حەوا.

١٠٦٨. خەسوو پێسە خوو.

١٠٦٩. خەسوو خۆشتی گەرەکە.

١٠٧٠. خەسوو شیرەکە کە فوو.

١٠٧١. خەسوو لە دوو جفت گا خاسترە.

١٠٧٢. خەفەت کێو لە بن تێرێ.

١٠٧٣. خەلە لە خەرمان، کلۆش وە باقە، لە دەرگای ماڵتان بکەن فەلاقە.

١٠٧٤. خەلە لە خەرمان، زیخ بای لە چەمان.

١٠٧٥. خەلەسێن، هەواڵ مەن ئەپرسێ.

١٠٧٦. خەلەی خۆی ئەفرۆشی مەنێ دوو شایی.

١٠٧٧. خەڵك ئەم زەمانە نان لە ناولینگیا ئەخوا.

١٠٧٨. خەڵك گەڕۆڵ، تفکردنیان لا فرەس.

١٠٧٩. خەڵك گەڕۆڵ پای خۆیان ئەننە بان قورسییەوە.

١٠٨٠. خەڵك گەڕۆل کەوچکیان نییە.

١٠٨١. خەڵکی مەدوێنە بە فیز و دەمار مەگەر لە لووتی فیل کەوتیتە خوار.

١٠٨٢. خەنە زۆر بێت، گوێی تێ ئەنن.

١٠٨٣. خەو بە گورگەوە ببینی تووشی زالم ئەبی.

١٠٨٤. خەو ژن چەپە.

١٠٨٥. خەوتن لە ئێوارەی درەنگا خراپە.

١٠٨٦. خەیار بۆ ژن عەیار.

١٠٨٧. خەیاڵ جێی نان ناگرێ، شێر بە رەوی ناخورێ.

١٠٨٨. خزم ناخزم وەکوو دووکەڵ تەپاڵە.

١٠٨٩. خشت مەردم مەشکێنە.

١٠٩٠. خشت وە ساڵی مەزەڵ کەچ ناوێت.

١٠٩١. خنجێر لە کا ئەدات.

١٠٩٢. خنجێر کالآنی خۆی نابڕێ.

١٠٩٣. خوێ لە کەوشی کە با بڕوا.

١٠٩٤. خوا ئەم پەنج قامکەی وەك یەك خەلق نەکردووە.

١٠٩٥. خوا با لە کەسێ هەر دوو چاوی کوێر ئەکا، باڵی ناشکێنێ.

١٠٩٦. خوا بە ماڵ هەژار نە پرسە بات نە زەماون.

١٠٩٧. خوا بەنەی خۆی خاس ئەناسێ.

١٠٩٨. خوا بەو لە بەوتر نەدات.

١٠٩٩. خوا بیا ناپرسێ، نەیشیا ناترسێ.

١١٠٠. خوا بیکا عەیب بەرەو ئەوا بۆ دواوە، عەیب دواوە ئەوا بۆ بەرەوە.

١١٠١. خوا بیوڕێ ئەم دەورە، شەواڵ تەنگ و قن گەورە.

١١٠٢. خوا بیوڕێ دەورە و زەمانە، مەلا ماچ ئەسێنێ سەرقەڵەمانە.

١١٠٣. خوا بیوڕێ دڵ لە دلێران، ڕێوی ڕاو ئەکا لە جێگەی شێران.

١١٠٤. خوا تۆڵەی بزن کۆڵ لە بزن شاخدار ئەکاتەوە.

١١٠٥. خوا تەختەتاش نییە، تەختە ڕێخەرە.

١١٠٦. خوا خواس، دنیا کا و باس.

١١٠٧. خوا دەلیل داماوە.

١١٠٨. خوا درووسمانی کردە بۆ تاعەتکردن نە بۆ خواردن و خەفتن.

١١٠٩. خوا دیانی دا، نانیش ئەدا.

١١١٠. خوا سەرمایە وە قەو حاڵ ئەدات.

١١١١. خوا چەپی نەکردە، پشی سوار پشت گا کردە.

١١١٢. خوا کەری ناسیوە، شاخی پێ نەداوە.

١١١٣. خوا کێر ئەداتە نێرەکەر و ماڵ وە مووسایی.

١١١٤. خوا کێو ئەبینێت بەفر ئەکاتە بانی.

١١١٥. خوا لە سوڵتان مەحموو گەورەترە.

١١١٦. خوا ماڵ بێسەودا بە هیچ کەس نادا.

١١١٧. خوا منی دیە و تۆیش ئەوینێ.

١١١٨. خوا وە کەروێشك ئەیژێ دەرچۆ و تانجی ئەیژێ بیگرە.

١١١٩. خوا هێلانە بۆ تەیری کوێر درووست ئەکا.

١١٢٠. خوا یار بێ، دونیا مار بێ.

١١٢١. خوارۆ بە ماڵ ئەوێت، زکەرۆ وەماڵ ناوێت.

١١٢٢. خوا کا تۆ دز نەویت، من درۆزن بم.

١١٢٣. خواکەی من بووە، خواکەی سوڵتان مەحموو.

١١٢٤. خوای گەرەکە و خورمایش.

١١٢٥. خوایا بدە مەرگم، زاوا نەکا جل و بەرگم.

١١٢٦. خوایا دەس بوەی بۆ خۆل بوێتە تەلا.

١١٢٧. خودا وەختێ غەزەب بگرێ لە مێرووله، باڵی پێ ئەدا.

١١٢٨. خوڵك خەسوو کەوچکێك چێشت تراوە.

١١٢٩. خوویێ بیگری بە جوانی، تەرکی ناکەی بە پیری.

١١٣٠. خوێن لە لووت کەس نەهات.

١١٣١. خوێن هیچ کەس لە هیچ کەس سوورتر (رەنگینتر) نییە.

١١٣٢. خوێن، خوێنی لە شوێنە.

١١٣٣. خوێنت بۆ گەڕۆڵی ئەبێت.

١١٣٤. خوێنی بخۆم ئۆخەی ناکەم.

١١٣٥. خێر زنە.

١١٣٦. خێر بخە دەریا گوم ناوێ.

١١٣٧. خێرت نییە، شەڕت وە پای سەو.

١١٣٨. خێڵێك سەرکردەی ژن وێت، سەری ئەچێتە قوڕا.

١١٣٩. داری تەمەڵی بە رەگی برسییەتی.

١١٤٠. دۆ هەتا زۆر بێت کەشك هەر رەقە.

١١٤١. دۆخەوا لە بارانەڕۆژا خۆشە.

١١٤٢. دۆرد و داغن وێت.

١١٤٣. دۆس لەسەر ئەڕوانێ، دوژمن لە پا.

١١٤٤. دۆست لە تەنگانەدا دەر ئەکەوێ.

١١٤٥. دۆستی بەوەفا وەك عەترفرۆشە، گەر لێیشی نەکڕی هەر بۆنی خۆشە.

١١٤٦. دۆستی دۆستم، دۆستمە، دوژمنی دوژمنم، دۆستمە.

١١٤٧. دۆستەکەت لە ئیشی بچووکا تاقی بکەرەوە، لە کاری گەورەدا کەڵکی لێ وەربگرە.

١١٤٨. دۆستی راست و بێمنەت کتێبە و بەس.

١١٤٩. دۆستی چاك وەك زێڕ وایە قەت رەنگی ناڕوا.

١١٥٠. دۆستی چاك پووڵی ناو گیرفانی خۆتە.

١١٥١. دۆست و دوشمنی خۆی ناناسێ.

١١٥٢. دۆسیش کۆنەدۆس.

١١٥٣. دۆسی و دوژمنی بە زۆر ناوێت.

١١٥٤. دۆشاو وە گونت.

١١٥٥. دۆعای مەکە، چاوت لار ئەوێت.

١١٥٦. دۆم بێ و کڵاش بۆخۆی بچنێ.

١١٥٧. دۆم هەتا رووت بێت مەزانی خۆشە.

١١٥٨. دۆ و دۆشاو تێکەڵ ئەکات.

١١٥٩. دۆی تورشیاو لە سەرما هاتە زوان.

١١٦٠. دۆی نەگەیی، دووکەڵی گەیی.

١١٦١. دایە گوێچکەی ها وە خورەی ئاوەوە.

١١٦٢. دار بە بێ بەر بۆ برین چاکە.

١١٦٣. دار بێ گەڵا زینەتی نییە، خۆیشك بێ برا قیمەتی نییە.

١١٦٤. دار بە هۆڕی خۆی نەبێ ناقڵیشێ.

١١٦٥. دار بەرزەو کە، سەگ دز دیارە.

١١٦٦. دار پوازی لە خۆی نەبێت ناقڵەشێ.

١١٦٧. دار زەڕ نەبێت هەر بۆت دێتە بەر.

١١٦٨. دار ساڵێ بەر نەگرێ ناوێ بیوڕن.

١١٦٩. دار و دیوار گوێی هەیە.

١١٧٠. دار وە نەمامی گۆچانی لێدەردێت.

١١٧١. دار هەتا بەری زۆر بێت، سەری شۆڕە.

١١٧٢. دار هەر دارە، پەڵك هەر پەڵکە، قەوم هەر قەومە، خەڵك هەر خەڵکە.

١١٧٣. دارا و نەدارا هەر دارای خەمە، ئەوەیش هەیەتی هەر ئەڵێ کەمە.

١١٧٤. دار لە دەستم داکەوتە.

١١٧٥. دارەکەی سەرکەل، پردەکەی گاڕان.

١١٧٦. داری بێبەر بۆ بڕین باشە.

١١٧٧. داری بنار بۆ گۆچان باشە.

١١٧٨. داری تەڕ وە قن قازی.

١١٧٩. داری گەنەڵ، گوێزی پووچەڵ، ئەی وە نەحلەت تایفەی کەچەڵ.

١١٨٠. داری ناوەتە ئاو بۆ خۆی.

١١٨١. داری نەرم کرم تێی ئەدا.

١١٨٢. دارێکە و لە بەر قولی خۆتی ئەدەی.

١١٨٣. دارێکم هەیە هەر دوو سەری گوواویە.

١١٨٤. دانا بە ئیشارەت، نادان بە کوتەك.

١١٨٥. دانەیەك گاڵ لە دەسی دەرنایێت.

١١٨٦. دانیشێ لەسەر گەنجی ئۆناسیس، لێم بێ بایەخە پیاوی داوێنپیس.

١١٨٧. داوای شانە لە کەچەڵ ئەکا.

١١٨٨. دایەگەورەی گوڵ غونچە، دەسێ بە لەو بوغچە.

١١٨٩. دایە لاما دەس و پا قەوی، نە سلامی کرد نە مانی‌نەوی.

١١٩٠. دایك بوینە و کچ بخوازە.

١١٩١. دایك دز شەوێك سینگ ئەخوا، شەوێك سینگ ئەکوتێ.

١١٩٢. دایك کراسکەوو نەمردە.

١١٩٣. دایك مەحموود شەقارم، پەن و پیتکەی رۆژگارم، جووجەڵە درمی‌یارم.

١١٩٤. دایکت بمرێ گوڵ وەخشان، نانی نەخوارد بردیشیان.

١١٩٥. دایه لووتی لاره.

١١٩٦. دایه لە چل چەم قولی تەڕ نەبووە.

١١٩٧. دە بدە بە هەشت، هەشت بگرە لە مشت.

١١٩٨. دەتوانی زیندوو بکوژی بەڵام مردوو ناتوانی زیندوو بکەیتەوە.

١١٩٩. دەتەوەێ ماسی بگری و قولت تەڕ نەبێت.

١٢٠٠. دە را ئەنازەی بگرە، یەك را ببوڕە.

١٢٠١. دەرزی لە چاوی خەڵکا ئەبینیێ، گاوەسنگ لە چاوی خۆیا نابینیێ.

١٢٠٢. دەرمان قن مەلعوون، کێر فیرعەونە.

١٢٠٣. دەروازەی شارێك ئەبەسرێت، دەم مەردم نابەسرێت.

١٢٠٤. دەریا بۆ ماهیان، کێفان بۆ ئاهوو.

١٢٠٥. دەریا بە دەم سەو پیس نابێت.

١٢٠٦. دەس باڵا دەس هەس.

١٢٠٧. دەس بە داس، چەقۆ بەلە هەسان، منەت ژنە دۆم مەکێشە.

١٢٠٨. دەس بشکێ، لار ئەگرسێتەوە.

١٢٠٩. دەس خۆی نییە ماری پێ ئەگرێ.

١٢١٠. دەس دەس ئەشۆرێت، دەسیش دەم و چاو.

١٢١١. دەس دەس ئەناسێت.

١٢١٢. دەس شکیاو و عەواڵ وە گەردن.

١٢١٣. دەس شکیاو کاری لێ تێت، دڵ شکیاو کاری لێ نایێت.

١٢١٤. دەس لـێنەدانی خاسە تا دەس لێداینی.

١٢١٥. دەس لە دەس و قووەت لە خوا.

١٢١٦. دەس مانی بنە بان سك تێرەوە.

١٢١٧. دەس و خەت خۆش، دوشمن نەخۆش.

١٢١٨. دەس وتی هانێ، زك وتی کوانێ.

١٢١٩. دەسێ کە دەسەڵاتی نەبێ، بۆ بڕین باشە.

١٢٢٠. دەستت چووە دەم سەگا، بیلاوێنە هاتە دەری تێری.

١٢٢١. دەستت ها وە خەنەوە وا دەسی بۆ ناوەیت.

١٢٢٢. دەسمی کردە وە رۆن داخا.

١٢٢٣. دەسو وە کەویرەو وێت، چاوت لە هەژار و فەقیرەو وێت.

١٢٢٤. دەسی زۆر سامانی نییە.

١٢٢٥. دەسی کەفتە تەنکی، بەر بوو لە قن نەنکی.

١٢٢٦. دەسێکت هەنگوێن، دەسێکت دۆشاو بێت، ئەیگەزێ.

١٢٢٧. دەفی دەنگ نادات.

١٢٢٨. دەڵ تا وەبا نەوێت، گۆڵ ناکەوێتە شوێنی.

١٢٢٩. دەڵەمە، دیان ئەشکێنێ.

١٢٣٠. دەلیلم هەنارد کاریەل بکا جەم، ماڵ دەلیل کاول بارمی کرد لە خەم.

١٢٣١. دەڵێن: کورد دەس بەی لە لێوی خۆی شەرح خۆی ئەکا.

١٢٣٢. دەڵێن ئەگەر میز بە کۆڵەکەزێڕینەدا بکەی، ئەگەر پیاو بێت دەبێ بە ژن و بە پێچەوانە.

١٢٣٣. دەڵێن سەگ بلورێنێ ساحێبماڵ مردووی لێ ئەمرێ.

١٢٣٤. دەڵێن گولستان بە حەوت ساڵەیی دەخوێنن بە حەفتا ساڵەیی لی تێدەگەن.

١٢٣٥. دەڵێن کچێك ئەنگوستیلە بکاتە دەستی بۆ براکەی خراپە.

١٢٣٦. دەڵێن کەسێك بەر دەرگا ئاوپرژێن بکات، بۆ ماوەی چل ڕۆژ بەرەکەت دەکەوێتە ماڵی.

١٢٣٧. دەڵێن مەڕ کەڕی بۆ ماڵ زۆر چاکە، چونکە هەموو ڕۆژێ دۆعا ئەکا خودا زۆر بە ساحێبەکەی بدا تا دیار نەبێت.

١٢٣٨. دەم ئەنێتە کانی و قنی فێنك ئەوێتەوە.

١٢٣٩. دەم بیچکی مامر لە خۆش ئێقباڵی کەڵەشێرە.

١٢٤٠. دەمێ تاڵ وێت، هیچ شەکەرێ شیرینی ناکا.

١٢٤١. دەم تەڕ و کاسە چەور.

١٢٤٢. دەم تەماحکار وەقن موفلیس.

١٢٤٣. دەم خەڵك دەروازەی خۆت نییە بیبەستی.

١٢٤٤. دەم خەڵك قن خۆت نییە بیقونجێنی.

١٢٤٥. دەم دەم نییە، ئەیژی دەوانەی دۆیە.

١٢٤٦. دەم و دۆی تاقی ئەکەمەوە.

١٢٤٧. دەمهەراش بە، دڵ هەراش مەوە.

١٢٤٨. دەمەکەو بێنە بینە لە کاشی، حەیفە ژنی جوان بۆ پیاوی ناشی.

١٢٤٩. دەمم ئەیژێ هانێ، سکم ئەیژێ کوانێ.

١٢٥٠. دەمی بۆی شیری لـێ تێ.

١٢٥١. دەمی بگرە وە قن قسە ئەکا.

١٢٥٢. دەمی قورسە.

١٢٥٣. دەمی لە کۆشی گەرمترە.

١٢٥٤. دەمی لە ماسا بێ پای لە لاسا بێ.

١٢٥٥. دەمی وا بەسیا مێش ناگرێ.

١٢٥٦. دەنگو بۆ ئەوەندە دلێرە.

١٢٥٧. دەنگی بە خوا نەوێت بە کەس ناگەیێت.

١٢٥٨. دەنگی خۆش بژێوی گیانە.

١٢٥٩. دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە.

١٢٦٠. دەنگ و زرینگەی پارە زۆر جار عەدالەت لە بەین ئەبات.

١٢٦١. دەنگی کەرەمتوو لە دەشت و کێفا، وەڕەی سەو لە حەوش و دریا.

١٢٦٢. دەوای موسافیر رۆیشتنە.

١٢٦٣. دەوڵەمەند بە مێشك پێویستیان نییە.

١٢٦٤. دەوڵەمەند دۆستی زۆرە.

١٢٦٥. دەوڵەمەندی خەسیس و فەقیری سەخی، دەبێ هەر دووکیان بۆ بابیان عاقڵ بکرێن.

١٢٦٦. دەویت زوو گەردەلوول ئەیگرێت.

١٢٦٧. دەین کەنیشك وە مل باوك ناحەساو.

١٢٦٨. درۆ ئەدات وەك کەڵ گامێش ئەڕوا بەڕێوە.

١٢٦٩. درۆزن تەماحکاری خەڵەتان.

١٢٧٠. درۆزن جارێك ناشتا ئەکا.

١٢٧١. درۆزن دەم خەڵکم.

١٢٧٢. درۆزن رووڕەش لای خواس.

١٢٧٣. درۆیێك لە کاتی تەنگانەدا بە ئەندازەی راستێك بە کەڵکە.

١٢٧٤. درەو خاس ئەکەی باقە و مەلۆت نییە.

١٢٧٥. درگا ئەوەسیێت، دەم مەردم ناوەسیێت.

١٢٧٦. درگای وە قن پێ ئەکەنەوە.

١٢٧٧. دڕك تنگس لە گوللەی ژێرسێ خراوترە.

١٢٧٨. دڕك دەکێڵی، دڕك تێتە ڕێت.

١٢٧٩. دڕك مەم و زینە لە کۆڵم ناوێتەوە.

١٢٨٠. درووس بڕۆ دوور بگەڕێوە.

١٢٨١. دریای ماڵتان وەك پڕوپلێنە، وەك ئازیزمردە لفکەکەو شینە.

١٢٨٢. درێژ عەقڵی ها لە چۆکیا.

١٢٨٣. دز بە و، مەرد بە.

١٢٨٤. دز ڕێگایەك دەگرێت، خاوەن ماڵ ڕێگەیەکی تر.

١٢٨٥. دز ماقووڵ ئەوێت، حیز ماقووڵ ناوێت.

١٢٨٦. دز ناشی کایان ئەبڕێ.

١٢٨٧. دز یەکێکە و شك هەزار.

١٢٨٨. دزی بێ دەسەك[1] ناکرێت.

١٢٨٩. دزی ڕێگا بە، دزی سەفەر مەبە.

١٢٩٠. دزی لە دز ناکرێ.

١٢٩١. دزی نەگرفتە سوڵتانە.

١٢٩٢. دڵ پەنجێرەی نییە.

١٢٩٣. دڵخۆشی نەخۆشیار ئەداتەوە.

١٢٩٤. دڵ کە پاکە، زمان بێباکە.

١٢٩٥. دڵ لە دڵ ئایەنە.

---

١ـ مەبەست لە دەسەك، دەسەدز یان هەمان دزکۆشکە یان ڕێنوێنەکەر و یارمەتیدەری دزە.

١٢٩٦. دڵ وە درۆ ناسووتێ.

١٢٩٧. دڵ وەسە پەتا، بپێچێتە هەر کەسا لە کۆڵی ناوێتەوە.

١٢٩٨. دڵ وەك مێش وایە، لە گوڵ ئەنیشێت و لە گوویش.

١٢٩٩. دڵی ئەونە گەورەس ئەیژی بەحرە.

١٣٠٠. دڵێ بشکێنی تازە ناوێتەوە هینەکەی ئەوەڵ.

١٣٠١. دنیا کڵاوچەرخانێکە.

١٣٠٢. دنیا کڵاو کڵاوە.

١٣٠٣. دنیا مارە.

١٣٠٤. دنیا ماڵە کوچانێس.

١٣٠٥. دنیا مانی لە چوونی زیاترە.

١٣٠٦. دنیا یا زۆردار ئەیخوا یا بێعار.

١٣٠٧. دوای باران کەپەنك.

١٣٠٨. دوای تاڵان، تەشت تەڵا بنە بان سەرتەوە.

١٣٠٩. دوای تڕ، قن ئەقونجێنێ.

١٣١٠. دوای تڕێ، خەمشە وڕێ.

١٣١١. دوای دایك و باوك کوڕ ئەوێتە ساحێوماڵ.

١٣١٢. دوژمن عاقل لە دۆس گەوج باشترە.

١٣١٣. دوژمنێك بۆ حەوت پشتم بەسە.

١٣١٤. دوژمنم بوێتە خولە یارە، بۆی ئەخەفم تا ئێوارە.

١٣١٥. دوژمنی دانا لە دۆستی بێ عەقڵ باشترە.

١٣١٦. دونیا ئاو ئەیوات، کەچەڵ خەو ئەیوات.

١٣١٧. دونیا بۆ کەس وەفای نییە.

١٣١٨. دونیا عومری نەمێنێ، سایلە دەم ئەسووتێنێ.

١٣١٩. دوو ببیسە، یەکێ بێژە.

١٣٢٠. دووجار گاییاو بەحیز دەبێت.

١٣٢١. دوو خۆیشك بۆ نانێ گرفتار بوون.

١٣٢٢. دوو دانە بێگون خەریکو یەکیان قۆڕ ئەکرد.

١٣٢٣. دوو دانە کەچەڵ قژ یەکیان ئەکێشا.

١٣٢٤. دوو ڕێوی، شێرێ کەوڵ ئەکەن.

١٣٢٥. دوو کەس بڕۆنە لای قازی، یەکێکیان دێتەوە ناڕازی.

١٣٢٦. دوو نان بۆ نانەوایی، هەڵوایێ بۆ پاچکە گایێ.

١٣٢٧. دوورخەڵەتێنەی بەر تڕێنە.

١٣٢٨. دوور کوژ و نزیك پووکاوڵ[1].

١٣٢٩. دوورم نزیك کردەوە.

١٣٣٠. دووری و دۆسی لە نزیکی و شەڕ خاسترە.

١٣٣١. دووری و دۆسی.

١٣٣٢. دووکاندارخاس زوان خاسی هەرەکە.

١٣٣٣. دووکەڵ مەکە چاو مەردم با دووکەڵ نەکەنە چاوت.

١٣٣٤. دووکەڵی ناچێتە چاو کەس.

١٣٣٥. دیاری شوان هاڵەکۆکە.

١٣٣٦. دیانم بوێ، نانم نەوێ.

---

١ـ مەبەست ڕواڵەتی ناحەزە.

١٣٣٧. دیانێك کە ئەیشێ چارەی کێشانە.

١٣٣٨. دیت گەنج قارِوون، چۆن چووە ژێر کاروون.

١٣٣٩. دێزە خلەو کەرەو سەر خۆی پەیا ئەکا.

١٣٤٠. دێزە رەشەکەی دوو کونا لە بن، دەسە چەورەکەی خۆت مەساوە لە من.

١٣٤١. دێزە وتی: بنم رەنگینە، کەوچك وتی: لەو لایەوە تێمەوە.

١٣٤٢. دێزە هەستا، گۆزەی لۆمە ئەکرد.

١٣٤٣. دێزەیەك کەیوانوو بیشکێنێ دەنگی نایێ.

١٣٤٤. دیوار حاشا زۆر بەرزە.

١٣٤٥. دیوار لەگەڵ تۆمە پاساری گوێت لی وێت.

١٣٤٦. دیوەخانی گەرم میوانی مێشە.

١٣٤٧. ژان لە ئیسقاندا، باشترە لە ژان لە دڵدا.

١٣٤٨. ژەنگ ئاسن ئەخوات و خەفەت دڵ ئەخوات.

١٣٤٩. ژەهرمار و قسەی ژن کاورا ئەکوژێ.

١٣٥٠. ژژوو دەڵێ لە بەچکەی خۆم نەرمتر نییە.

١٣٥١. ژژوو بە بەچکەی خۆی ئەڵێ رۆڵە، بەچکەی کێ بەقەد تۆ نەرم و نۆڵە

١٣٥٢. ژن ئازا بەهار رۆن ئەکا، ژن خوێڕی پاییز.

١٣٥٣. ژن ئەگەر وەدەس خۆی وێت، کراس حەوت تەختی بۆ خۆی ئەبڕێ.

١٣٥٤. ژن ئەو ژنەسە ئەوەڵ شەو بەریە بگرێ.

١٣٥٥. ژن ئەو ژنەسە دەس گرێتە ماڵ خۆیەوە.

١٣٥٦. ژن ئەوەڵ نۆکەرە، ژن دووهەم دۆسە، ژنی سێهەم پاوشاس.

١٣٥٧. ژن ئەیژێ: هەر سوح لێم دەن تا شەو وەك شێر، شەو هاتیتەوە ئاشتم بەرەوە.

١٣٥٨. ژن بۆ پیاو پیر، کەنیشك بۆ جاهێل.

١٣٥٩. ژن بێ جەهاز نازی نییە، کاورای بێپووڵ زوانی نییە.

١٣٦٠. ژن بێ مێرد، وەك ماڵ بێحەسار وایە.

١٣٦١. ژن بە جوانی بخوازە، جگەر بە گەرمی بخۆ.

١٣٦٢. ژن بە ژن مردوو، گا بە گا مردوو.

١٣٦٣. ژن بە قەرز نابێت.

١٣٦٤. ژن بەنایە، پیاو کرێکار.

١٣٦٥. ژن بیر ناکاتەوە، مەگەر لەبەر ئاوێنە.

١٣٦٦. ژن تا نەزێ بێگانەس.

١٣٦٧. ژن جوان دەردەسەری جوانە.

١٣٦٨. ژن حەساو پیاوە.

١٣٦٩. ژن خۆ دەف نییە لە دوای دەفەکەت بینیتە ئەولاوە.

١٣٧٠. ژن خاس چرای ماڵە.

١٣٧١. ژن خاس واجبە و ژن خراو حەرام.

١٣٧٢. ژن دوو رۆژ عەزیزە، ئەو رۆژەکە تێت و ئەو رۆژە کە ئەڕوێ.

١٣٧٣. ژن قژی درێژە و عەقڵی کورت.

١٣٧٤. ژن کە نەتوانێ تۆڵە بسێنێ، وەك منداڵ ئەگری.

١٣٧٥. ژن لە دێهات بخوازە نە لەسەر شەقام.

١٣٧٦. ژن لە مشك دەترسێ، مشك لە پشیلە، پشیلە لە سەگ، سەگ لە پیاو، پیاو لە ژن.

١٣٧٧. ژن ماچی نەکەیت، جوانییەکەی نامێنێ.

١٣٧٨. ژن موعەمایێکە، هیچ کەس حەلی ناکا.

١٣٧٩. ژن ناشیرین خۆشی لە جام نایەت.

١٣٨٠. ژن نانەجیب وەك شۆربای بێ خوێ وایە.

١٣٨١. ژن نەجیب شوەکەی ها لەژێر پەتوی موحیبەتا.

١٣٨٢. ژن نیمەی ژنە، نیمی ژانە، نیمەی قاتڵ حەوت خوانچە نانە.

١٣٨٣. ژن و پشی لە رۆژێکدا کەفتن.

١٣٨٤. ژن و دیانت ئەبێ موازبەتی لێبکەی، ئەرێ نەیکەی زوو خراو ئەبێ.

١٣٨٥. ژن و شوتی بێڵا با بگەیێ.

١٣٨٦. ژن و شوو شەڕ ئەکەن، گەوجەکان باوەڕ ئەکەن.

١٣٨٧. ژن و شێڵانەی گەیی هەردووکی خاسە.

١٣٨٨. ژن و عادەت وەنەیەك، تینەنیشی وەلـێ دەرنابیت.

١٣٨٩. ژن و میوان و باران دوای سێ رۆژ گەوجت ئەکەن.

١٣٩٠. ژن وا لە کۆڵانا فریشتەس، لە ماڵەو ئیبلیسە.

١٣٩١. ژن وە ئاسانی وە تەڵا گەوج ئەوێت.

١٣٩٢. ژن وە چیا ئەیناسی وە پایین کراسی.

١٣٩٣. ژن وەسە دار بی، لە هەرکوێنا بینێی سەوز ئەوێت.

١٣٩٤. ژن وەکوو باخە، هەتا ئاوی بدەی دەپشکێتەوە.

١٣٩٥. ژن هەسان پیاوە.

١٣٩٦. ژن هەیە ماڵ ئاوا ئەکا، ژن هەیە ماڵ وێران ئەکا.

١٣٩٧. ژن هین خەڵکە، مناڵ هین کەمەرە، رەفیق هین دڵە.

١٣٩٨. ژن هێنان و ژن نەهێنان هەردووکیان پەشیمانییە.

١٣٩٩. ژن یا بە هەمارێ پارە یا بە همارێ درۆ.

١٤٠٠. ژنێ بخوازە ئەرێ پیاو وێت، باشترین رەفیقت وێت.

١٤٠١. ژنە ژنە، عومری منە.

١٤٠٢. ژنت نییە، خەمت نییە.

١٤٠٣. ژن و بزن وەنە یەك، دایمە تەقەی شاخیان دێت.

١٤٠٤. ژنی جوان نەسیبی کەچەڵە.

١٤٠٥. ژنی چاك لە برای هاوپشت چاکترە.

١٤٠٦. ژنی چاك وەکوو ئاوێنەی ماڵ وایە.

١٤٠٧. ژنیان کردە پاوشا، رۆژێ حەفت را بزنی ئەبرپیەوە.

١٤٠٨. ژنیش هەیە و ژانیش هەیە.

١٤٠٩. ژێرییەکە نەیەنکان، بانییەکە ئەینکان.

١٤١٠. ژێرهارە ناناڵێنێ، بانهارە ناڵە ناڵیە.

١٤١١. رۆژ با و بۆران کەچەڵ سەر شۆران.

١٤١٢. رۆژان رۆژانی لە دوایە.

١٤١٣. رۆژوو باشترین دەرمانە.

١٤١٤. رۆژی بێقەوڵ ناگیرێ.

١٤١٥. رۆژی نەفسی نەفسییە، کەس ئاگای لەکەس نییە.

١٤١٦. رۆڵەم بخۆیتە خوێندن بە کەڵکە نەخوێندەواری کولکێشی خەڵکە.

١٤١٧. رۆڵەی بێدایە، تاجر بێمایە، درەخت بێسایە.

١٤١٨. رۆن رژیاو ئەکا وەخێر باوکی.

١٤١٩. رۆن رژیاو جەمەو ناوێت.

١٤٢٠. رۆین خۆش ها لەژێر سم کەرا.

١٤٢١. ڕۆینم بە دەس خۆمە، هاتنەوەم بە دەس خۆم نییە.

١٤٢٢. ڕێی حەق لە هەنگوێن شیرینترە.

١٤٢٣. ڕێ لە مەردم مەوڕە با خوا ڕیگەت لـێ نەوڕێ.

١٤٢٤. ڕاحەت کەسێکە کەری نییە لە کا و جۆیش خەبری نییە.

١٤٢٥. ڕازت لای یەکێ دانێ پرست لای هەزار.

١٤٢٦. ڕازی دڵی بردە ژێر گڵ.

١٤٢٧. ڕاست ئەڕۆم باوك حاکم ئەگێم، کەم ئەخۆم دایك حەکیم ئەگێم.

١٤٢٨. ڕاست بەو بەلای شێرا بڕۆ.

١٤٢٩. ڕاستی ڕەفتی، چەفتی کەفتی.

١٤٣٠. ڕەحم بە بەچکەی مار ناکرێ.

١٤٣١. ڕەحمکردن بە زۆردار، زوڵم لە هەژارە.

١٤٣٢. ڕەز بۆ ڕەزەوان، بەی بۆ بێزەوان.

١٤٣٣. ڕەفیق دز و شەریك قافڵە.

١٤٣٤. ڕەم تا جێی نەکەیتەوە نەیچەقێنی.

١٤٣٥. ڕەمەزانی وە قنێ ئازاوە گرت، نۆرەی شەشەی شەشەڵانیەسی.

١٤٣٦. ڕەمەقی دا.

١٤٣٧. ڕەنج خۆت و گەنج خۆت.

١٤٣٨. ڕەنج سەرئەنجامی گەنجە.

١٤٣٩. ڕەنجی بووە، ڕەنجی قۆلانجە.

١٤٤٠. ڕەنگ پاشین ئاسانە، لێکردنەوەکەی گرانە.

١٤٤١. ڕەو وە ڕیشە، گلێنە وە بنەتوو.

١٤٤٢. رەوی وریا بە، نە نەچیر خەوتوو.

١٤٤٣. رەوی خۆی نەئەچووە کونا، هەژیپەکی ئەبەست بە کلکیەوە.

١٤٤٤. رەوی خەفلۆك مامر لە خەوا ئەوینێ.

١٤٤٥. رەوی لە کون خۆی ئەترسێ.

١٤٤٦. رەوی وەختێ سۆح لە کون تێتە دەروە لە نیوەڕۆی خۆی ئەڕوانێ.

١٤٤٧. رژد رووی خۆشە.

١٤٤٨. رژدی رسوایی ها لە شوێن.

١٤٤٩. رواڵەت مەوینە، وا لە دڵ بزانە.

١٤٥٠. روو بەی بە مێوان ئەبێ بە ساحێومال.

١٤٥١. رووزەردی کێشان، مایەی بێ دەسەڵاتییە.

١٤٥٢. روو لە نامەرد کردن خراوترە لە مردن.

١٤٥٣. روو بە روو ئەکەوێت و چاو بە چاو.

١٤٥٤. رووی زەمانە رەش بێت.

١٤٥٥. رووی نەبوونی رەش بێ.

١٤٥٦. رێحانە رەشە وەلێ بۆنی خۆشە.

١٤٥٧. ریخ نەوێت لەناو کەوشەکەتا بۆچی ئەشەلی.

١٤٥٨. رێش بووە ریشەوە ئەبێ شانەی بۆ هەڵگری.

١٤٥٩. ریش پرۆفسۆری مەهێڵنەوە با مەردم نەیژن بزنەکە هاتەوە.

١٤٦٠. ریش چەرموو ئەوێسێ وە تەلارەوە، ئەیژی هێسرە ها وە هەوسارەوە.

١٤٦١. ریش میوان ها لەژێر دەس ساحێومالا.

١٤٦٢. ریشم لە ئاسیاوا چەرموو نەکردە.

١٤٦٣. ریشەی تەواوی شتەکان سێ شتە، زێڕ، زەوی، ژن.

١٤٦٤. رێگای پا لە رێگای دەم رۆشنترە.

١٤٦٥. رێگای سوار بوون و دابەزین یەکێکە.

١٤٦٦. رێوی بێتە سەر رێگا خاسە بە پێچەوانە کەروێشك خاس نییە کلۆڵە.

١٤٦٧. رێوی تا سیلسیلەی خۆی خوێندەوە کەولێیان کەند.

١٤٦٨. رێوی دەڵێ: ناشی راوچی وەختێك لە ماڵ دەرئەچێ من تەقەی گونی لە کێف ئەبیسم.

١٤٦٩. رێوی دنیادیە، چاکترە لە شێر خەوتوو.

١٤٧٠. رێوی لە کون خۆی هەڵگەڕێتەوە گەڕ ئەوێت.

١٤٧١. رێوی نانی بێ شەرتی تەواوە، شێر نانی نەبێ پشتی شکاوە.

١٤٧٢. رێویەکی بەرەڵڵا چاکترە لە شێرێکی ناو قەفەس.

١٤٧٣. رێگەیەك بوێت خۆمی پیا بڕۆم.

١٤٧٤. زۆر حەقیش ئەشێلێ.

١٤٧٥. زۆر کاری گەورە پیاو بچووك ئەیکا.

١٤٧٦. زۆر موسیبەتە دوو شت لە دنیا، جوانی تەمەڵ و ژنی بێ حەیا.

١٤٧٧. زۆر وتن بۆ قورئان خۆشە.

١٤٧٨. زۆرەملێ ملشکاندنی بەدواوە هەیە.

١٤٧٩. زۆڵ لای دیوار ئەکا وەقن خۆیەوە.

١٤٨٠. زارم دیتی زکم نەیدی.

١٤٨١. زام با سام و تیر قۆلانجە.

١٤٨٢. زامن یا دەس بە کیسە یا دەس بە پەنجە.

١٤٨٣. زامی سەری سەگ، سەگ دەیکا چارە.

١٤٨٤. زانین بە گەورەیی نییە.

١٤٨٥. زاوا زاوا وێت، بووکی لای ئاوا بێت.

١٤٨٦. زەڕ و زێوەرات لە خەزانا، ڕێوی برسی لە دەشتانا.

١٤٨٧. زەرەر لە نیوەی گەڕێتەوە قازانجە.

١٤٨٨. زەرف زەرفی چینی، قاڵی قاڵی یەزد، نان نانی گەنم، دین دین محەمەد.

١٤٨٩. زەماندار بەڕوو ئەکات بە تابووت.

١٤٩٠. زەماوەنە، هەیت و هووتە، پلاو نییە دۆڵمەی رووتە.

١٤٩١. زەماوەندێ بۆ پووڵ سەر بگرێت، بۆ پووڵیش ئەشێوێت.

١٤٩٢. زەمینفرۆش شەوێك تێرە، زەمینسێن شەوێك برسی.

١٤٩٣. زەنگ ئەیژێ بشکم، نەك بزڕم.

١٤٩٤. زەوی سەختە و گا لە گا ئەگرێ تاوان.

١٤٩٥. زەهری وەك مار ئەڕژێ.

١٤٩٦. زستان هات بەرگی فەقیری دڕی.

١٤٩٧. زك بیگری مشتێکە، بەری بەی دەشتێکە.

١٤٩٨. زکو با نەکا، تڕ وەك تانجی ڕا نەکا.

١٤٩٩. زکی برسی خوا ناناسێ.

١٥٠٠. زماندرێژی نیشانەی دەس کورتییە.

١٥٠١. زمان ژن وەکوو شمشێر وایە، هیچ وەخت نایێڵێ ژەنگ بێنێ.

١٥٠٢. زمسان بۆ یەکێ کاری تەیار وێ، ماینەکەی بۆرە و ژنەکەی سالار وێ.

١٥٠٣. زمسان پلاسە، هاوین کراسە.

١٥٠٤. زمسان شەوێکی بمێنێ حەق خۆی ئەسێنێ.

١٥٠٥. زمسان لە سەرما ناکەفێت.

١٥٠٦. زوو لە خەو هەڵسی، زوو رۆژ ناوێتەوە.

١٥٠٧. زوان بوێسێ سەر سلامەتە.

١٥٠٨. زوان تەڕ پاراوە.

١٥٠٩. زوان خۆت گرێ بدە.

١٥١٠. زوان ژن وەسە شمشێر.

١٥١١. زوان لە دەمیا نییە.

١٥١٢. زوانی درێژە، دەسی کوڵ.

١٥١٣. زوقمێك بۆ مێروولە، وەك تۆفانێکە.

١٥١٤. زوو لە نوێژ ئەچی.

١٥١٥. زووخاو دنیام چەشت.

١٥١٦. زێڕم دا بەڵام کڕی.

١٥١٧. زینحای دایك خۆم کردوێت.

١٥١٨. سۆرە، سۆرەوی خۆی هەر ئەکا.

١٥١٩. سۆفی بەرماڵ لە کۆڵانەکان.

١٥٢٠. سۆفی وە حەکاڵەوە، مەلا وە بەرماڵەوە، کوڕ و کچیان بردە ماڵەوە.

١٥٢١. سۆ لە سۆ ئەچێ، گلۆڵە لە پۆ ئەچێ.

١٥٢٢. سێ مانگەی پاییز شێفـوەرد ئەکا، ئەکەوێتە هاوین گەنم قەرز ئەکا.

١٥٢٣. سێ و دووی لـێ مەکە.

١٥٢٤. سابوون لەژێر پام مەدە.

١٥٢٥. ساتێ بژی شێر بی، نەك سەد ساڵ بژی لەژێر بی.

١٥٢٦. ساحێوماڵ رەزایەتی داوە، دز رەزایەت نادا.

١٥٢٧. ساحێوماڵ و نۆکەر خۆمم.

١٥٢٨. ساحێوماڵ ئەگەر لە گوری بترسێ، ناوێ مەڕ رابگرێ.

١٥٢٩. ساڵ دوو بەهار نییە.

١٥٣٠. ساڵ ساڵ و ماڵ ماڵ.

١٥٣١. ساڵێ باران نەوارێ کانی ناژیێتەوە.

١٥٣٢. سالاّنو خەوان، مانگانیش بخەوێنە.

١٥٣٣. ساڵێ ماڵ و ساڵێ مناڵ.

١٥٣٤. سایلەی ساردەو بوو قەوم و برای لێ گردەو بوو.

١٥٣٥. سایەساوە، سوری دڵبەرێ، کاسە نەشۆرێ، ماڵ وێرانکەرێ.

١٥٣٦. سەبر تاڵە، بەری شیرینە.

١٥٣٧. سەد گوناه و یەك تۆبە.

١٥٣٨. سەد کراس بدڕە وە پاکی، کراسێ مەدڕە وە پیسی.

١٥٣٩. سەد نەعلەت لەو سەگانەی کە گورگەمێشن، کەلاك بۆ گورگی برسی رائەکێشن.

١٥٤٠. سەر بێ رۆزی ها لە ژێر خاکا.

١٥٤١. سەربەسەر بێ دەردەسەر.

١٥٤٢. سەر خۆش بێت، کلاّو فرەس.

١٥٤٣. سەر دائەپۆشێ و قنگی ئەفرۆشێ.

١٥٤٤. سەر ساڵ و ئەوەڵ کار.

١٥٤٥. سەر گوریسەکەی دا بە دەسیەوە.

١٥٤٦. سەر لە ماڵ دۆسا بتاشە، ناخوون لە ماڵ دوژمنا.

١٥٤٧. سەرێ لە سك دایك بێتە دەرەوە، تازە ناچێتە جێی خۆی.

١٥٤٨. سەرێ لەناو سەرانا نەوێت بۆ نەبوون باشە.

١٥٤٩. سەرچۆپی بەیتە دەس سەگەوە، ئەیوا بۆ لای خوانچەی نانەکە.

١٥٥٠. سەرچەرموویی کاری وەسن و ساڵ نییە، کاری ها وە خەم و خەفەتەوە.

١٥٥١. سەرگوڵی گەنم بێدەلیل وشك ناوێت.

١٥٥٢. سەرم بشکێنە نرخم مەشکێنە.

١٥٥٣. سەرما بۆ زستان، گەرما بۆ هاوین.

١٥٥٤. سەرما زۆر بیرێت بۆ هەر کە، وەك کەروێشك هەزارە ئەکا.

١٥٥٥. سەرمایەت بۆ خۆت، زەکاتت بۆ خوا.

١٥٥٦. سەر و چاوی ئەیژی کولانەی قەرەچییە.

١٥٥٧. سەری ئەشکێنێ و تیماریشی ئەکا.

١٥٥٨. سەری بێ دەلاك مەتاشە.

١٥٥٩. سەری پیاوی عاقڵ هیچ کات نایشێ.

١٥٦٠. سەری دونیا وە پووش نەگیراوە.

١٥٦١. سەری گەورە بەڵای گەورەی هەیە.

١٥٦٢. سەری لە پاوشاییا وێت قنی هەر مەفرەقە.

١٥٦٣. سەرێك کە نایشێ دەسماڵی پێوە ناوەسن.

١٥٦٤. سەرێکی هەس و هەزار زوان.

١٥٦٥. سەرینم سۆسەن، پایینم پەتە، موارکت وێت، لارەپێچ خۆتە.

١٥٦٦. سەگ ئەتسێ ئەیژێ ئابە نەفەسێ.

١٥٦٧. سەگ بە ئاسمان گەڤینە.

١٥٦٨. سەگ زۆر شەرەفی هەیە لەو کەسەی خەڵك ئازار ئەدا.

١٥٦٩. سەگ قاچی ئەشکێ کلکی هەڵئەوەسن.

١٥٧٠. سەگ لە سەگ بەردە، خۆت تماشا کە.

١٥٧١. سەگ و مزگەوتیان نەوتووە.

١٥٧٢. سەگی بەسراو بە خەو راو ئەبینێ.

١٥٧٣. سەگی تێر نەچیر راو ناکات.

١٥٧٤. سەفەر سەفەرە و رێگە زۆر دوورە، عاقیبەت مردن تۆشە زەروورە.

١٥٧٥. سەفەرعەلی بە تەمای قەمەرعەلی وێت، کەری پشتەڕێژ باری خاڵی وێت.

١٥٧٦. سەفەر لە کوڵەچوارشەما خراپە.

١٥٧٧. سەفەرە و هەر لە بەرە.

١٥٧٨. سەفەر و مەعامەڵە سەنگی مەحەکە.

١٥٧٩. سەلکی سیری یا قنجی پیازی.

١٥٨٠. سەما وە دڵ شەخس ئەکرێ.

١٥٨١. سەماوەر بگرێ بێژنگ هەڵناسوورێ.

١٥٨٢. سەنگینی خانم مایەی بێچارەیی شوویەتی.

١٥٨٣. سەو ئینچکەس و پاس قەرەول[1] ئەکا.

١٥٨٤. سەو بەرەڵا لە هەر لایێکا ئەتسنە ملیا.

١٥٨٥. سەو برسی ئەکەفێتە شوێن پیاو.

١٥٨٦. سەو بوگرێ جەو نەوگرێ.

١٥٨٧. سەو پیر نەهامەتی وێت ئەوێتە شۆخی تووتك.

---

١ـ ناوی دوو گوندی سەر بە شاری سەقزە، کە لە تەنیشت یەك هەڵکەوتوون.

١٥٨٨. سەو خۆی خاسە، هەتا تووتکە سەوەکەی.

١٥٨٩. سەو خاس بێشەی خاسی هەرەکە.

١٥٩٠. سەو فرە بخوا هار ناوێت.

١٥٩١. سەو کلکی لێ با ئەکەفێت.

١٥٩٢. سەو لە تەنگانا بە قەو گوری را ئەکا.

١٥٩٣. سەو لە ساحێوی شێرە.

١٥٩٤. سەو لەسەر نانا ناوەڕێ.

١٥٩٥. سەو لە کولێرە راناکا.

١٥٩٦. سەو لەبەر دریای ساحێویا دوڕە.

١٥٩٧. سەو و منداڵ لە گەوج خۆشیان تێ.

١٥٩٨. سەو وە ئاسمان ئەوەڕێ.

١٥٩٩. سەو وەڕی، بووك لە ماڵ دەرپەڕێ.

١٦٠٠. سەو هار چل رۆژ عومریە.

١٦٠١. سەوێ قن ئاسیاوی ئەلێستەوە، سەوێ تر قن ئەوی ئەلێستەوە.

١٦٠٢. سەوز و سەمەنی تەقە نەکەی ئەیشکێنی.

١٦٠٣. سەوزەگیا و بەرەو دوا.

١٦٠٤. سەهۆڵ سەخت و سایەقە، گەن هەر گولی لایەقە.

١٦٠٥. سەیرەیەك لە دەستا باشترە لە دوو سەیرە لە ناو دارا.

١٦٠٦. سڕ خۆمان و تڕ خۆمان.

١٦٠٧. سرینچك بەری زۆر بێت، دەڵێن زستانی سارد ئەبێت.

١٦٠٨. سزی مەخە.

١٦٠٩. سزای گرانجان نەکرپینە.

١٦١٠. سفرەی بێخوێ، ئاوڕووی ساحێوماڵ ئەوا.

١٦١١. سفرەی دڵ خۆت ناوێ لە لای گ کەسێ رابـخەی.

١٦١٢. سك برسی شەرمی نییە.

١٦١٣. سکی برسی ئەوەڕێ بە شوێنی پیاوا.

١٦١٤. سڵاو کورد بێ تەماح نییە.

١٦١٥. سڵپە چایی کەوێتە سەر پیاڵە مێوانمان دێ.

١٦١٦. سلێمان بێ ئیمان، مەنێ ئارد و نیم مەن نان.

١٦١٧. سم سم کەرە، چنگ چنگ یاسێ، من لەم کارە سەرم ئەماسێ.

١٦١٨. سوار ئاگای لە پیادە نییە.

١٦١٩. سوار ئەسپ خەڵك بیت هەر پیادەی.

١٦٢٠. سوار بوون عەیبێکە، داوەزین هەزار عەیب.

١٦٢١. سوار تا نەگلێ بە سوارچاك نابێت.

١٦٢٢. سوار سوار بوو لە هەردوو لاوە، دەس جڵو وەبان کەڵپۆز تەڵاوە.

١٦٢٣. سوار لە سوارخاسی مەڕوانە لە ئیخلاقی بڕوانە.

١٦٢٤. سوار لە کۆڵ زین ئەهێنێتە خوارەوە.

١٦٢٥. سوارە هەی سوارە، قەجەر هەی قەجەر، سوار سوار بووە مل وەکەس نەر.

١٦٢٦. سواڵکەر، سواڵکەری هەس.

١٦٢٧. سواڵ کیمیاس.

١٦٢٨. سواڵ لە سواڵکەر حەرامە.

١٦٢٩. سواڵکەر بە شاییش چاوی لە سواڵە.

١٦٣٠. سوراو و سپیاو جادووکارییە، خاڵ خوارشتو هەر دیارییە.

١٦٣١. سووری دیە، سەمای لەبیرەوە چووە.

١٦٣٢. سێ پا لەسەر سێ لنگ ئەوێسێ.

١٦٣٣. سیر ئەدا لە سویلێ.

١٦٣٤. سیر مەخۆ با بۆی سیر لە دەمت نەیێ.

١٦٣٥. سیرمان دەخوارد، زورنامان لێ دەدا.

١٦٣٦. سیروان ئەگەر لێت نەدەم، هەر ئەم وەیت.

١٦٣٧. سێف سوور بۆ دەس کوڕ خان خاسە.

١٦٣٨. سینەی بێکینە بەر موحەممەد سەڵەوات.

١٦٣٩. شۆخی سەرەتای شەڕە.

١٦٤٠. شۆخی شۆخی، کلکە قنێ شۆخی.

١٦٤١. شۆخی وە ئەسڵەحە مایەی دوژمنییە.

١٦٤٢. شا چۆنە و گەدا چۆنە.

١٦٤٣. شا کەلی ئەکەفێ لە گەدایێ.

١٦٤٤. شا هەنگوورە و سوڵتان خەربوزە، شوتی هەر ئاوە، ترۆزی بێمەزە.

١٦٤٥. شاران گەڕاوە درۆ فرە ئەڵێ.

١٦٤٦. شاعیر مەیرێسە ئیتر بەسە و بەس، بەختەبارانە، شەمە کەسە و کەس.

١٦٤٧. شاکان رۆیین، کاخەکان جێمان.

١٦٤٨. شانسەکەی ناری گووی لێ ئەباری.

١٦٤٩. شانسی دایك جیازی کچە.

١٦٥٠. شاواش خۆت بە و قنج هەڵپەڕە.

١٦٥١. شای کەسان خۆیە (خودایە).

١٦٥٢. شایەعە نیوەی درۆیە.

١٦٥٣. شایی خۆمە و خەڵك سەری تێ ئەساوێ.

١٦٥٤. شت ماڵ هەمزە بووە بۆ ماڵ هەمزە.

١٦٥٥. شتێ گۆشتی پێ ناگری بۆ گۆشتی پێ دانی.

١٦٥٦. شەخس تا با[1] نەنوێنێ، کولێرەچەورە ناکەنە خێری.

١٦٥٧. شەڕ بۆ گەماڵ هاتووە.

١٦٥٨. شەڕ بە تفەنگ، مامەڵە بە پارە.

١٦٥٩. شەڕ تەواو بوو شەڕ قوژیاوە، کەچەڵ بۆ دار ئەخولیاوە.

١٦٦٠. شەڕ خۆش نییە، شەڕنامەی خۆشە.

١٦٦١. شەڕ سواڵکەر لە ئاشتی دەوڵەمەند چاکترە.

١٦٦٢. شەڕ کێ کردی، غارەت کێ بردی.

١٦٦٣. شەڕکردن لەگەڵ دۆستا ئاشتییەکەی خۆشە.

١٦٦٤. شەڕ لە بەشەر نابڕیێت.

١٦٦٥. شەڕ لە بێکاری باشترە.

١٦٦٦. شەڕ لە دەمی ئەوارێت.

١٦٦٧. شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان.

١٦٦٨. شەڕ مەکە و بێ قرەیش دامەنیشە.

١٦٦٩. شەراب هەتا کۆن وێ خۆشترە.

١٦٧٠. شەرت بێ بە شەرتی پیاوان.

---

١ـ با: کەڵك و بەهرە.

١٦٧١. شەرع بنی قوڵە، هەر دۆڵێکیان وە باوایێ سپاردووە.

١٦٧٢. شەرعی مار بە دار.

١٦٧٣. شەرم و حەیا، خۆشبەختی هەر دوو دونیایە.

١٦٧٤. شەڕی خۆتڕین مەکە.

١٦٧٥. شەریك باش بوایە، خوا شەریکی بۆ خۆی پەیدا ئەکرد.

١٦٧٦. شەڕێکە گۆشت برژیاو دەرناچێ.

١٦٧٧. شەریکی هەر خەریکییە.

١٦٧٨. شەق ئەزانێ قوناخ ها لە کوێ.

١٦٧٩. شەق وە شەق ئەیژێ جێم کەرەوە.

١٦٨٠. شەك وە شەکی خاسە، ئەوە حەساوە وە شوێن بەرخیا راکا.

١٦٨١. شەل نییە ئەلەنگێ.

١٦٨٢. شەلە باوانم، کۆرە باوانم.

١٦٨٣. شەلەم نەمری بۆ قوڵتەت.

١٦٨٤. شەلەی قن گێڕە عاشقی ئەکا، پای هەڵتەکەفێ ناشوکری ئەکا.

١٦٨٥. شەمە کار، شەمە بار، شەمە بووکی تیا مەکە سوار.

١٦٨٦. شمشێر کە داتوەشاند قەڵغانت پێ بێ.

١٦٨٧. شەنە لە مەنە کەمترە.

١٦٨٨. شەو داچکە جاوین گۆشت مردوو جاوینە.

١٦٨٩. شەو گایێك بە، گوێزێك مەخۆ، سۆح گایێك بە، گوێزێك بخۆ.

١٦٩٠. شەو قەڵای مێردە.

١٦٩١. شەوێ مێوانی، دوو شەو مێوانی، سێ شەو لە جێی گەماڵەکانی.

١٦٩٢. شەوخێز خێز بکە، لە خەو بشکێنە، کلیلی خەزای خەسرەو[1].

١٦٩٣. شەوقی لە تەپاڵە بڕیوە.

١٦٩٤. شەوی تاریك، ڕێگەی باریك.

١٦٩٥. شەوی گەدا درێژە.

١٦٩٦. شەیتانی ئینسان، هەر ئینسانە.

١٦٩٧. شەیتان بێکار وێ، برۆ و برژانگ خۆی هەڵئەکەنێ.

١٦٩٨. شەیتان عەجەلەی کرد، چاوی خۆی کوێر کرد.

١٦٩٩. شتێکی لە گووی خۆیا دۆزیوەتەوە.

١٧٠٠. شکەستەکان، پلیکانەی سەرکەوتنە.

١٧٠١. شڵپەی ئاو تێ، میوانمان تێ.

١٧٠٢. شمشێرت پەڵەی هەور دابێرێ، ئاخرت هیچە.

١٧٠٣. شمشێری میسری لە کێلاندا ناوەستێ.

١٧٠٤. شەواڵ بێ بەنەخوێن کەیتە پات دائەکەوێ.

١٧٠٥. شوان ئەیژێ چ گوێچکەی خۆم بوڕن چ کەپەنکم.

١٧٠٦. شوان تا دانیشێ ڕانەکەی دوور ئەکەوێتەوە.

١٧٠٧. شوان پاڕاسی ئاواییە.

١٧٠٨. شوان وە گۆچان، وەیلە وە داوان.

١٧٠٩. شوانێ نەسیحەتی کوڕەکەی کرد: پیاوی چاك بە، بەڵام هێندە چاك مەبە گورگ دەرفەتت لێ بێنێ.

---

١ـ مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر ئەتەوێ دەوڵەمەند بووی، دەمەو بەیان زوو لە خەو هەڵسە تا بە خەزانە و گەنجی پاوشاکان بگەی.

١٧١٠. شوانی ناپاك لە گورگ خراپترە.

١٧١١. شوغڵ مایەی حەیاتە.

١٧١٢. شووتی لە لێژا ناوێسێ.

١٧١٣. شووتی ئەوەی بۆ نەخۆشیار.

١٧١٤. شووتی تا نەشکێ نازانی ناوەکەی چۆنە.

١٧١٥. شووتی لە زمسانا بـخۆی، ئەشێ لەپای لەرزەکەیا بوێسی.

١٧١٦. شووتی مەخۆ با شێت نەوی.

١٧١٧. شووڵی موعەلیم گوڵە، هەر کە نەیخوا گولە.

١٧١٨. شووی کافر لە برای موسوڵمان چاکترە.

١٧١٩. شێت قسەی لەسەر نییە.

١٧٢٠. شێت لەسەر ران خوی گۆشت ئەخوا.

١٧٢١. شێت لە هار خراوترە.

١٧٢٢. شێت نوشتەی هەس، بەڵام گەوج نییەسی.

١٧٢٣. شێتە جرجری، نانەکەی خوارد و سفرەکەی دڕی.

١٧٢٤. شێر ئەگەر لە برسا بمرێ، جێ دەمی رێوی ناخوا.

١٧٢٥. شێر بێ ئامێژەن ناگرسێ.

١٧٢٦. شێر بمشکێنێ، نەك رێوی بمخوات.

١٧٢٧. شیر دۆشیاو ناچێتەوە گوان.

١٧٢٨. شیر چەپەڵ کریاو تازە پاك ناوێتەوە.

١٧٢٩. شیر گەورە و بچووك دەیخوا تا منداڵ، پیاو ئەو پیاوەسە سڵ نەکا لە تاڵ.

١٧٣٠. شێر لە بێشە ناوەڕێێ.

١٧٣١. شێرماڵ و ڕێوی دەر.

١٧٣٢. شیر وشتر و دیاری عەرەب.

١٧٣٣. شیردا، بۆ داپیردا.

١٧٣٤. شیرم قەڵغان دەور سەرت وێت.

١٧٣٥. شیر و برنج بەفری لێ بوارێت باوەڕی پێ مەکە.

١٧٣٦. شیرین و سەوزی دانەی هەناری، لاقت بەرزۆکە دەنکێ قەرزاری.

١٧٣٧. شیشەی شکەست سالم نەمەبۆ، ئاغە وە بابەی رەعیەت نەمەبۆ.

١٧٣٨. شێف لە بن بەردا ئەکا.

١٧٣٩. شێفوەردم کە و لە بان بەردم کە.

١٧٤٠. شین بووە شیوەن.

١٧٤١. شێواوە وەك چێشتی مجێور.

١٧٤٢. شیوەن فێر دایكمردوو مەکە.

١٧٤٣. چ باوێت چ باوە، گشتی ئەچێتەو لاوە.

١٧٤٤. چ مێوژێك بخۆی چ گۆیژێك.

١٧٤٥. چۆپی بە دەس گامێشەوە هەر ئەیبا بۆ ناو ئاو.

١٧٤٦. چۆخە ڕەشە، خۆت هەڵکێشە، خوێن ئەکا.

١٧٤٧. چۆڕ چۆڕە نیشتە لەبەر گونم، تازە وە تەمای ماڵ و ژنم.

١٧٤٨. چۆنەر خۆرەتاو بنی قەوییە، پاخەسوو ئەترێ خەتای وەوییە.

١٧٤٩. چۆنەر وە گۆشت ناوێ، هاوزاوا وە قەوم ناوێ.

١٧٥٠. چۆنەر هەتا تەنك وێت، بنی قەوییە.

١٧٥١. چاکەن لە بێخ چاس.

١٧٥٢. چاو بفرێ مێوانمان دێ.

١٧٥٣. چاو چووە خەو قن ئەچێتە پاوشایی.

١٧٥٤. چاو چووە خەو، قن ئەچێ بۆ ڕاوەکەو.

١٧٥٥. چاو کوێر چرای هەرەك نییە.

١٧٥٦. چاوبرسی ئاوڕووی نییە.

١٧٥٧. چاوت نییە خۆ لووتت کونە.

١٧٥٨. چاوەڕێی دەس بی هەر خەو ئەبینی.

١٧٥٩. چاوڕاس بۆ چاوڕاس، دەم لار بۆ دەم لار.

١٧٦٠. چاوی بەرایی نادات براکەی خۆی بوێنێ.

١٧٦١. چاوی خێل، باشترە لە چاوی کوێر.

١٧٦٢. چاوی رشتیە بە خۆڵەکەوان، شەڕ ئەکا بە کەرەکەوە.

١٧٦٣. چاوی سوور کردە.

١٧٦٤. چاوی کوێر فرمێسکی کرد.

١٧٦٥. چاویان بۆ دیتن داناوە.

١٧٦٦. چاوێکت کوێر بێت نەك چاوەڕوان بیت.

١٧٦٧. چاوێکە و فرمێسك هەزار.

١٧٦٨. چاییەکەت ساردە قەنەکەت رەقە، چایی بۆ کێ تێری کەچەڵەی قن رەقە.

١٧٦٩. چایی بێوەژن بۆ دیان خاسە.

١٧٧٠. چت خۆش حەیفە بۆ نەخۆش.

١٧٧١. چ کەرەکە بوەیتە لای بارەکە، چ بارەکە بوەیتە لای کەرەکە.

١٧٧٢. چتێ ئەکەفێتە روو، حاشای ناوێ.

١٧٧٣. چتێ لە چاوم هەڵێ لە برۆیشم هەڵێ.

١٧٧٤. چەپ چەپ تماشای خەڵك مەکە، با راست راست تماشات نەکەن.

١٧٧٥. چەرخی رۆژگار گەر تیغێکی دا بـە دەستت، هەرچـی دڵـت ویسـتی بیـبڕە ئـەما نـان کـەس مەبڕە.

١٧٧٦. چەق بە لە هەسان، منەت ژنە دۆم مەزان.

١٧٧٧. چەقۆی لـێ بەیت خوێنی نایێت.

١٧٧٨. چەك بۆ رۆژی جەنگ، قەوم بۆ رۆژی تەنگ.

١٧٧٩. چەم بێ چەقەڵ نابێت.

١٧٨٠. چەن پەراسووی لە ئۆمەت موحەممەد زیاترە.

١٧٨١. چەن کراسی زیاتر لە من دڕییە.

١٧٨٢. چل ماڵە هاوسا بە دەورا مەحرەمن.

١٧٨٣. چەن مەردە هەللاجە[1].

١٧٨٤. چەنێ پێتم وت مەچۆ ئەو دۆڵە، ئەکەنە قنتەو ئەو جفتە زۆڵە.

١٧٨٥. چەوری بە لە هەسان، زەرب بە لە شان، منت قن قەرەچی مەزان.

١٧٨٦. چپە یا حیزییە یا دزییە.

١٧٨٧. چرا لە پشت سەرەوە رۆشنایی نادات.

١٧٨٨. چرای دەس کۆرە، کۆر دەس چاوساقە.

١٧٨٩. چرای ماڵە فەقیر مانگەشەوە.

١٧٩٠. چرای ناکەسان تا وە رۆژ گڕیا، کۆنە وەجاخان قاڵیان بڕیا.

---

١ـ مەبەست لە هەللاج، مەنسووری حەللاجە کە لە زیندانی سەردەمی عەبباسییەکاندا زۆر خۆڕاگر و بـوێر بـووە و زۆر ئازاری چێشتووە، هەر بۆیە بۆ ئازایەتی و کۆڵنەدان بەناوبانگە.

١٧٩١. چل دەروێش لەسەر بەڕەیەك ئەسازان وەلێ دوو پاوشا لە شارێکا نەئەسازان.

١٧٩٢. چلە چکۆلە ئەیژێت من بوایەم لە جیاتی کاکەم دەس پیرەژنم لەناو خوانچە هەویرا ئەڕچان.

١٧٩٣. چواردیواری و ئیختیاری.

١٧٩٤. چوار چت لە چوار چت تێر ناون: ژن لە شووی خاس، زەوی لە باران، ئینسان لە زانین، چاو لە رووی یاران

١٧٩٥. چوارچاو وە چۆماڵەوە کون ئەدۆزێتەوە.

١٧٩٦. چوکوڵ مەکە قن خەرەنێزە.

١٧٩٧. چونکە یار ئەهلە، کار سەهلە.

١٧٩٨. چوو بۆ گووکردن پاڵتاوەکەی دا بە بردن.

١٧٩٩. چووە ئەردەبێڵ[1] سەر وە ئاردەوە، کردە و پەشیمان گوویی خۆی خواردەوە.

١٨٠٠. چووەسە باڵ مەل.

١٨٠١. چووم بۆ ماڵیان بۆ هەسان، بەرەتووکیان ئەخووسان.

١٨٠٢. چوومە ماڵەو بۆ لەمتەر، یەکێ ئەیدا وەك عەنتەر.

١٨٠٣. چوومە ماڵی ئەرمەنی، قوڵتەقوڵتی سەمەنی.

١٨٠٤. چوومە ماڵی جوولەکە، قوڵتەقوڵتی کوولەکە.

١٨٠٥. چی بچنیت ئەوە ئەدووری.

١٨٠٦. چیمان هەس هەر ئەیژێ کەمە، ئەویشمانە هەس هەر ئەیژێ خەمە.

١٨٠٧. چێوی خوا بێدەنگە.

١٨٠٨. گۆرانیوێژ ئەشێ بوێر وێت.

١٨٠٩. گۆڕی هاتە گۆڕخانە.

---

١ـ ناوی پارێزگایەکە لە رۆژئاوای ئێران هەڵکەوتووە.

١٨١٠. گۆزەی تازە ئاوی خۆشە.

١٨١١. گۆزەی چەنگی، ئاو دوو رەنگی.

١٨١٢. گۆزەی سوور هەمیشە بە ساقی لە کانی نایێتەوە.

١٨١٣. گۆش ئازیزە و گۆشوارە ئازیز.

١٨١٤. گۆشت گەردەملە و لە کۆڵ نابێتەوە.

١٨١٥. گۆشت کەروێشك ناخۆم، منەت تانجیش ناکێشم.

١٨١٦. گۆشتەکەی ئەخۆی، گۆشتاوەکەی ناخۆیت.

١٨١٧. گۆم هەتا قووڵ بێت، مەلەی خۆشە.

١٨١٨. گا بە دەنگی جووتیار ئەڕوا.

١٨١٩. گا جووت ئەکا و گاوەسنگ خۆڵ ئەکاتە سەر خۆیا.

١٨٢٠. گاڕەش دەم چەرموو.

١٨٢١. گا زوانی نییە، بەنەش ئیمانی نییە.

١٨٢٢. گا گولەی پەت لە ملە.

١٨٢٣. گا کردی و کەر خواردی.

١٨٢٤. گا لە بەرەو لەقە ئەخا، ولاّخ لە دواوە.

١٨٢٥. گا لە دەم جووتیار ئەڕوانێ.

١٨٢٦. گا لە گا، گۆشت لە گۆشت.

١٨٢٧. گا لە لەقەی مێش ئەترسێ.

١٨٢٨. گا وە گونا ئەناسێ.

١٨٢٩. گاراجی بەرزە و ماشینی نزمە.

١٨٣٠. گاسوور ماماجی[1]، لە گێرەی خۆیانا بنەیی نەئەکرد لە هی خەڵکا سەرپەرپشی ئەکرد.

١٨٣١. گاگەل هەمووی بە تالاّن چووە، ئەو دەڵێ مانگا بەڵەك چی لێهات.

١٨٣٢. گاکە بفرۆشە، کەرەکە بەسمانە، لەنجە ملوورە لە جێی کەسمانە.

١٨٣٣. گام نییە لە گالا، پام لە نۆرا ئەکوتیێ.

١٨٣٤. گام ها وە بارەوە دۆینەم هاوە دارەوە، کاکەم داوای ژنم لێ ئەکا.

١٨٣٥. گام هاوە بارەوە، مەلا وە کورم بخوێنە.

١٨٣٦. گای پیر لە حەیوەت قنیا کەلاّیی ئەکا.

١٨٣٧. گای جووت لەخۆڕا ناشکێ شاخی، پشیلەش لەخۆڕا ناقرتێ کلکی.

١٨٣٨. گای کلك باریك.

١٨٣٩. گەر بتەوێ ئەتوانی.

١٨٤٠. گەر خوا مەیلی بێت، ماڵ با بە کەسێ، دریای خەزانەی هەر بۆ ناوەسێ.

١٨٤١. گەر خوایش مەیلی بێت ماڵ نەدا بە کەس، دەسی قۆفڵ ئەکا و تون چاوی ئەبەسێ.

١٨٤٢. گەر دار بە دەس ویت زۆر مەیوەشێنە، بزانە رۆژان، رۆژی لە شوێنە.

١٨٤٣. گەرەکیە بترێ، رێقنەی سپی کرد.

١٨٤٤. گەردن لە موو باریکترە.

١٨٤٥. گەردوون بێ گەردوون، گەل لە هەوالاّن.

١٨٤٦. گەز لە کوێ و جاوو لە کوێ.

١٨٤٧. گەلە هەراش، خەلە هەراش.

١٨٤٨. گەماڵ زۆری بۆ بێنی وەك تانجی را دەکا.

---

[1] ـ کابرایەك بەناوی مام مەجی گاییێکی هەبووە لە گێرە و جووتکردن بۆ خەڵك سەرپەرِی دەکرد بەلاّم لە کاری ماڵی خۆیاندا دەخەفت.

١٨٤٩. گەماڵ زمهەرِ ناکا، ئەکەوێتە بەهار.

١٨٥٠. گەماڵ وە زستانا دەم کاتەوە دیارە وشکەساڵە.

١٨٥١. گەماڵ وە مانگەشەودا ئەوەڕێ.

١٨٥٢. گەماڵەکەت وە پێشە رازی کە، ژنەکەیشت وە درۆ.

١٨٥٣. گەنەکار حەز لە تەنیایی ئەکا.

١٨٥٤. گەنج ئەگەڕێتەوە بۆ سەر خەزێنە.

١٨٥٥. گەنم گرد و جۆ بڵاو.

١٨٥٦. گەنم لە ژن بسێنە، رۆن لە پیاو.

١٨٥٧. گەوادی پیاو بە چاویا دیار نییە، بە ملپانیا دیارە.

١٨٥٨. گەوج ئاو ئەدا لە ئاسیاو.

١٨٥٩. گەوج باشە، گەوجزادە خراوە.

١٨٦٠. گەوج نەچێتە بازاڕ، بازاڕ ئەگەنێ.

١٨٦١. گەوجەی ئاوجاوە.

١٨٦٢. گەورە ئاو ئەرژێنێ، بووچك پای تێ ئەخا.

١٨٦٣. گەورە کۆڵەکەی ماڵە.

١٨٦٤. گەورە کە یەك بن، میللەتێك سەر ئەخەن.

١٨٦٥. گەورەیی ماڵ لە سایەی سەر ژنە.

١٨٦٦. گەورەیان گەورە وتە و بووچکیان بووچك.

١٨٦٧. گەورەیی بە عەقڵە نە بە ساڵ.

١٨٦٨. گژەبا فەقەت ماڵ فەقیر ئەوات.

١٨٦٩. گرێ هەرچی بیکێشی سفتتر ئەوێت.

١٨٧٠. گرێیەك کە بە دەس باز ئەوێت بۆچی بە دیان ئەیکەیتەوە.

١٨٧١. گسك بسووتێنی مەڕ و ماڵات وشك دەکات.

١٨٧٢. گشتی بەرتیل ئەیکا.

١٨٧٣. گلۆڵەم کەفتە لێژی.

١٨٧٤. گلۆڵەییێ موو بابە، خۆت لە بێحەیا لادە.

١٨٧٥. گلەیی لە گەوج ناکرێ.

١٨٧٦. وتیان وشتر کۆچەکت هات، ئەویش وتی بار من هەر سەد مەنە.

١٨٧٧. گورگ پیر بوێ، ئەبێ بە مەسخەرەی سەگ.

١٨٧٨. گورگ گورگێکە، لە رۆژ تەنگانە قن لە یەك ئەکەن.

١٨٧٩. گورگی یاخی ماڵ شایش ئەخوا.

١٨٨٠. گورگ قیمەت وشتری بزانیایێ سکی هەڵ نەئەدڕی.

١٨٨١. گوری بتخوا، پەنا بە رەوی مەبە.

١٨٨٢. گوری چووزانێ قیمەت قاتر.

١٨٨٣. گوری لە پێس مەڕا.

١٨٨٤. گوری وەخت پیری دیان خۆی ئەژمێرێ.

١٨٨٥. گورییە هار پەڕیە بان دار.

١٨٨٦. گوریس وە لانەی یەك مەنی نەئەگەییەوە، خۆی بۆ دوو مەنی ئەکوتا.

١٨٨٧. گوڵپەنبە وتنی خەسوو، سەر وەوی ئەشکنێ.

١٨٨٨. گول گول بوایە، هاوسا ماڵی دائەوەشان.

١٨٨٩. گول قسە زل.

١٨٩٠. گول لە گولی مەڕوانە، لە هەڵوەدای بڕوانە.

١٨٩١. گوڵ لەسەر سەریوان سەوز دەبێت.

١٨٩٢. گوڵاڵەسوورە دەشتان دابگرێ، تماشاکردن هیچ کونێ ناگرێ.

١٨٩٣. گوڵەبەڕۆژە خۆپەرستە.

١٨٩٤. گولەی بایز ئاغا و تەقە لە کەڵەنان.

١٨٩٥. گوم شێریان کرد.

١٨٩٦. گوناح ئێمە ئەکاتە چەنێ.

١٨٩٧. گوو ئەکا و گاگێرەی بۆ هەڵ ئەوەسێ.

١٨٩٨. گوو لەگەوڕا کەر.

١٨٩٩. گووی وشك وە قنەو نالکێ.

١٩٠٠. گووی وشك وەناو مشتەوە ناوێسێ.

١٩٠١. گوێرەکە نەمرێ ئەوێتە گا.

١٩٠٢. گوێرەکەی گەدا، گوێرەکەی دەوڵەمەند ئەوەسێتەوە.

١٩٠٣. گوێز ئەرێ گوێز وێت، سفتی خۆی نیشان ئەدا.

١٩٠٤. گوێز بە ژمارە مایەی خۆی دیارە.

١٩٠٥. گوێز بشکێنە بەختو تاقی بکەرەوە.

١٩٠٦. گوێز لە خەوا پاوشایی ئەکا.

١٩٠٧. گوێچکەم لـێ نییە، قەڵام قایە، داییم و دەرهەم دریام قاییمە.

١٩٠٨. گیا بۆژەی بەهارمان نەخواردووە.

١٩٠٩. گیا قانگ لە ماڵا بسووتێنی هەم بۆ ماڵ و هەم بۆ مەڕ و ماڵات باشە.

١٩١٠. گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە.

١٩١١. گیامان بە گوێ نەجاویە.

١٩١٢. گیان ها لە جێگەی سەختا، دەرناچێ.

١٩١٣. گیسك بەر تایە.

١٩١٤. گیسکەکەی هەیاس[١].

١٩١٥. عازەولەری بێ مشتەری.

١٩١٦. عاقڵ دوو جار ناخەڵەتێ.

١٩١٧. عاقڵ کارێ ناکا دوایی پەشیمان ببێتەوە.

١٩١٨. عالەم وە جن پێ ئەکەنێ، جنیش وە ئاشەوان.

١٩١٩. عەترێ کە خۆی ئەنوێنێ بە دەم تاریفی مەکە.

١٩٢٠. عەجەو کەر وەفالێکە.

١٩٢١. عەجیب ئیمڕۆ خۆر لەو کێوە هەڵهاتە.

١٩٢٢. عەجەلە فەقەت بۆ کاری خێر باشە.

١٩٢٣. عەجەلە کاری شەیتانە.

١٩٢٤. عەداڵەت باشترە لە عیبادەت.

١٩٢٥. عەشقی پیری وەك گوڵ وایە لەسەر سەریوان.

١٩٢٦. عەقڵ سووك باری قورسە.

١٩٢٧. عەقڵ لە جوانخاسی باشترە.

١٩٢٨. عەلی فرە ئەخوا، وەلی گول ئەوێت.

١٩٢٩. عەولاو بە رەنجی شان تێتە ناو.

---

١ـ هەیاس گوایە پیاوێکی زۆرزان بووە لەسەردەمی سوڵتان مەحموودی غەزنەویدا ژیاوە کە زۆر موعەما و گرفتی گەورەی چارەسەر دەکرد. رۆژێك پاوشا پێی دەڵێ: من گیسکێکت پێ ئەدەم، بەڵام بە مەرجێ لە دوای شەش مانگ بەخێوکردن نە قەڵەو بێ نە لەڕ. دەڵێن هەیاس هەموو رۆژێك تا ئێوارە گیسکەکەی لەوەڕاندووە و لە ئێوارەدا سەری گورگێکی پێ نیشانداوە. گیسکەکە ترساوە و ئەم کارە بووەتە هۆی ئەوەی گیسکەکە قەڵەو نەبێت.

١٩٣٠. عەیبە عابایە، نامووس حەیایە.

١٩٣١. عەیبەکەی تۆ جلێ لە بانی، هینەکەی من دنیا پیزانی.

١٩٣٢. عەیبی خۆمم بۆ بەیان کە دوو بە دوو.

١٩٣٣. عەیبی خۆی دەخاتە تەلیس، هی خەڵك دێنێتە مەجلیس.

١٩٣٤. عوزر لە قەباحەت خراوترە.

١٩٣٥. عیسا بە دین خۆی، مووسا بە دین خۆی.

١٩٣٦. غیرەتت سەگ بیخوا.

١٩٣٧. فاتەی سوورەوان[1].

١٩٣٨. فارس بە قەڵەم، تورك بە قیام، کورد بە تفەنگ.

١٩٣٩. فەسایی ئاخری نییە.

١٩٤٠. فەقەت ئاوێنە دۆس بنیامە.

١٩٤١. فەقیانە چەرموو لفکە بابردوو، تۆ ژنت بۆ چەس لە برسیا مردوو.

١٩٤٢. فەقیر بۆ ئەوە رووی رەشە، لای مناڵی خۆیشی سەر دادەنەوێنێ.

١٩٤٣. فەقیر با درگای لێ ناکاتەوە، خزمی خۆیشی لای لێ ناکاتەوە.

١٩٤٤. فەقیر چاوی هاوە ماڵ خەلکەوە.

١٩٤٥. فەقیر لە هەر دوو دونیا رووڕەشە.

١٩٤٦. فەقیر وە دەمەوە بخەفێ، درك ئەچێتە قنیا.

١٩٤٧. فەقیری خۆی خۆشە و قۆرتەکەی ناخۆشە.

١٩٤٨. فەلا لە داخ سەر و قنگ خەرمان، زوو ریش چەرموو ئەکا.

١٩٤٩. فەلەك بۆ بەختم ئەناڵێنێ.

---

١ـ ژنێکی خراپکار و بێحەیا بووە و هەردەم خەریکی نانەوەی ئاژاوە، خلوو و فیتنە بووە.

۱۹۵۰. فیتنە هەمیشە رسواس.

۱۹۵۱. فرە بکەنی، فرە ئەترِی.

۱۹۵۲. فرە وتن لە نەزانینە.

۱۹۵۳. فرەخۆر هەمیشە بار سکی ئەکێشێ.

۱۹۵٤. فرەخۆرە، گوو فرەکەرە.

۱۹۵۵. فرەوێژ هەر دێ وەدەمیا، درۆ بێ یا راس.

۱۹۵٦. فلاَن کەس دنیای لـێ بووە بە قن چۆلەکەوە.

۱۹۵۷. فلاَن کەس زوو نەهاتی، خەسووت خۆشی لێت نەهات.

۱۹۵۸. فلاَنی ئیمشەو تا بەیانی وەك چۆلەکە، چنگم بە ئاسمانەوە بوو.

۱۹۵۹. فلاَنی دیانێکی وە چل ساڵ دەرهاتیە.

۱۹٦۰. فووی خۆت لە گوێی خۆت.

۱۹٦۱. فێرکەران فێری مەکە، فێریشی ئەکەی تێری کە.

۱۹٦۲. فیز مەکە، چەپەڵ ئەویت.

۱۹٦۳. فیزی زلە، ئەسپی دوومەن ئەخوا.

۱۹٦٤. فیسقە لە پای سەنگ و مەن.

۱۹٦۵. فیکە بە بێلێو ئەکەن.

۱۹٦٦. فیکر چرای مێشکە.

۱۹٦۷. فیکری گەنم کە خەربوزە ئاوە.

۱۹٦۸. قۆداز لە لێوار خۆیا ئەکەوێتە خوارەوە.

۱۹٦۹. قۆز بە دەمار دەمار ئەفرۆشێ، تەماکۆی خۆی نییە، سیگار ئەکێشێ.

۱۹۷۰. قۆلانجە لە بۆی گوڵ سەری ئەیشێت.

١٩٧١. قاپان ئەکا بۆ لاپان.

١٩٧٢. قاپانکەر نەیژێ وەگونەو هیچی پێ ناکرێ.

١٩٧٣. قاپی دانا بۆ چۆڕ ئەگەڕێ.

١٩٧٤. قاپی نەماوە گزە ئەکا.

١٩٧٥. قاز تا قەڵەو بێت، قنگی تەنگ ئەبێتەوە.

١٩٧٦. قاز هات دەمەلاسکێی باز کاتەوە، قاچێکی شکا.

١٩٧٧. قاز هات لاسایی باز کاتەوە، چاوی خۆی کوێر کرد.

١٩٧٨. قازانج سەر مایەی خوارد.

١٩٧٩. قازانگ مەردان وە حەوتساڵ تێتە کوڵ.

١٩٨٠. قاچ گەورە نیشانەی هەنگاوی گەورەیە.

١٩٨١. قالاو وتی: بەچکەم بوو بە یەك و دوو قەت تێرم نەخوارد لە گوو.

١٩٨٢. قەت دەرزی دروومان هەرتك لای تیژ نییە.

١٩٨٣. قەدر زەڕ ها لە وەلای زەڕنگەرەوە.

١٩٨٤. قەدر ها وە لای قەدرزانەوە.

١٩٨٥. قەرز دوو ماڵ ئاوەدان دەکات.

١٩٨٦. قەرز کۆن ئەوێت بەڵام نافەوتێ.

١٩٨٧. قەرز مەدە بە هاوڕێ با هەر دووکیان لە دەس نەدەی.

١٩٨٨. قەرزار قەرزارە و بانەکەیشی دڵۆپە ئەکا.

١٩٨٩. قەرزار نەمرێ وە قەرز خۆی ئەگەیێ.

١٩٩٠. قەرزدار دەس سکمم.

١٩٩١. قەرزدان وەك فڕێ دانە، قەرزگرتنەوە وەك دۆزینەوە.

١٩٩٢. قەرزدایین بە شێتی، وەرگرتنەوە بە عاقڵی.

١٩٩٣. قەزای باوکێ کافر کەوێ لە دە مامەی موسوڵمان.

١٩٩٤. قەزای کەر خۆم ئەخەم لە ئەسپی تۆ.

١٩٩٥. قەزای هیچ کەس لە هیچ کەس ناکەوێ.

١٩٩٦. قەساوەیەل باریان کرد، سەویەل هاتنە جێیان.

١٩٩٧. قەسەم سەختی وە گیان دار و بەردە.

١٩٩٨. قەل وتی بە قەل رووت رەش بێت.

١٩٩٩. قەڵەم لە باوك و برایش باشترە.

٢٠٠٠. قەڵەمی پەڕانە.

٢٠٠١. قەنخۆر خوا قەنی بۆ ئەنێرێ، خەمخۆر خوا خەمی بۆ ئەنێرێ.

٢٠٠٢. قەور دەوڵەمەن لە قەور فەقیر گوشاوترە.

٢٠٠٣. قەور مردی تیا نییە وە سەریا ئەگیرێ.

٢٠٠٤. قەورم هالە کوێ تا کفنم بوێت.

٢٠٠٥. قەوڵ سەبری عەمەڵە.

٢٠٠٦. قەوڵی پیاوان گیانی هەیە.

٢٠٠٧. قەوم ژنان بەرە وە بەرە، قەوم مەردان دەرە وە دەرە.

٢٠٠٨. قەوم گۆشت بخوا، پێشە ناشکێنێ.

٢٠٠٩. قەوم لە قەوم ناوڕێ.

٢٠١٠. قەوم وە بێگانە مەکە.

٢٠١١. قەومی وەسە ریش گولی.

٢٠١٢. قەومی چاك قیبلەیە.

٢٠١٣. قەومی وە هامشۆ رەفتەوە خۆشە.

٢٠١٤. قەیچی مەدە بە یەکا قەیچی دەم ئەوێت.

٢٠١٥. قەیم وەجاخان شوێنیان بڕیا، چرای ناکەسان تا وە رۆژ گڕیا.

٢٠١٦. قەییمی ئەیژن: منالْ کەر وە کۆپانەوە ئەخوا.

٢٠١٧. قژ بێتە نێو چاو، مێوان خۆشەویستمان دێ.

٢٠١٨. قسە ئەکەی قسەی لـێ ئەوێتەوە، قسە ناکەی جێگەی ناوێتەوە.

٢٠١٩. قسە تا ها لە دەمتا تەلاّس بەڵام وەختێ جۆڕانت گەلاّس.

٢٠٢٠. قسە حەوت سالْ بنە چالْ، ئەگەیێتەوە خاوەن مالْ.

٢٠٢١. قسە قسە تێرێ، خەو خەو تێرێ.

٢٠٢٢. قسە کەوتە زارێ، دەکەوێتە شارێ.

٢٠٢٣. قسە کەوتە سی و دوو دیان، ئەکەوێتە سی و دوو مالْ.

٢٠٢٤. قسەکردن وەك خەرجکردن وایە، گوێگرتن وەك کاسپیکردن وایە.

٢٠٢٥. قسە مەکەن با قسەی لـێ نەوێتەوە.

٢٠٢٦. قسە هەتا لە دەما وێت زێڕە، عانێك لە دەم هاتە دەرەوە، زێڕ دەس دەملارە.

٢٠٢٧. قسە هەزارە، یەکی بەکارە.

٢٠٢٨. قسە هیچی تێ ناچێ.

٢٠٢٩. قسە، قسە دێنێ.

٢٠٣٠. قسەی ئێوارە، ئاوەنیای شەوەکی.

٢٠٣١. قسەی بێفکر کردن وەسە تیری بێ نیشانە گرتن.

٢٠٣٢. قسەی بەر کوورەکە گەرمە.

٢٠٣٣. قسەی تا بەر بەنەخوێنەکەی بڕناکا.

٢٠٣٤. قسەی تەك قن خۆیا نییە.

٢٠٣٥. قسەی تێکراری وەك گووخواردن وایە.

٢٠٣٦. قسەی حەساوی جواوی نییە.

٢٠٣٧. قسەی حەق، رەقە.

٢٠٣٨. قسەی خۆت لەو جێگە ببیستە وا قسەی خەڵکی تیا دەکەن.

٢٠٣٩. قسەی خۆی بردە بان دار.

٢٠٤٠. قسەی خراو مەکە، قسە سەر وەخاوەنە.

٢٠٤١. قسەی ژن وەسە تڕ بزن.

٢٠٤٢. قسەی فلانەکەس وەك تڕ بن گۆم وایە.

٢٠٤٣. قسەی قەوم و خێش، وەك تیری دوژمن دەبڕێ.

٢٠٤٤. قسەی کەچەڵی خۆی ناکا، قسەی گەڕۆڵی خەڵك ئەکا.

٢٠٤٥. قسەی وا ئەکا بەردی پێ تێتە غار.

٢٠٤٦. قسەیەك ئەکەیت و هەزار پێچ ئەکەیتەوە.

٢٠٤٧. قشقەڕە دۆمان، هەڵپەڕە بۆمان.

٢٠٤٨. قشقەڕە لە خۆڕایی پشت گامێش ناخورێنێ.

٢٠٤٩. قل بە فل حاڵی بووە.

٢٠٥٠. قلمان وە قلتان، دەسکە قولەنگمان بە قنگتان.

٢٠٥١. قلیان تازەتاش سەرچەم بولغاری، لایەق وەسەرکار ساغ مەقاشکاری.

٢٠٥٢. قن ئەو شەقمە نییە، وازم لێ بێنە.

٢٠٥٣. قن بە بان شەواڵ خۆت.

٢٠٥٤. قن بترێ باشە تا دەم.

٢٠٥٥. قن گەورە، جووز بیچکۆلە.

٢٠٥٦. قنەر بوورە بۆ خەزوورە.

٢٠٥٧. قنەر و ماس وەخت خۆی ئەخوریێ.

٢٠٥٨. قنی قن مێشوولەس، هیلکەی قاز ئەکا.

٢٠٥٩. قوڕ وە سەرم بۆ نۆکەرم، تیکە ئەگرێ وەقەو سەرم.

٢٠٦٠. قورئان ئەفرۆشێ بە نان.

٢٠٦١. قورئانێ بێرن بیننە بێژنگ با بچینە تکای گوڵە بێوەژن.

٢٠٦٢. قورباق وە قۆبەرە قەوی ناوێت.

٢٠٦٣. قوڕە ڕەشە وە بان سەر ئەو کەسە کە راز دڵ خۆی وەلای ژنەکەیەوە ئەیژێ.

٢٠٦٤. قورسی تا نەیشێوێنی گەرمای نییە.

٢٠٦٥. قوڵتەی دڵم وەسە قوڵتەی سەماوەر.

٢٠٦٦. قولف گۆزەکەو مەفرەقە، پچە خەوی نائێی بیانکی کچە.

٢٠٦٧. قولی ڕەش و سپی لە بوارا دەر ئەکەوێ.

٢٠٦٨. قیتەی ماساوخۆر.

٢٠٦٩. قینێ ماڵ ئاوا ئەکا، قینێ ماڵ وێران ئەکا.

٢٠٧٠. کۆتر لە مۆتەکێ لە بۆتەی قەسرێکە.

٢٠٧١. کۆسە چوو بۆ ریش، سمێڵی دانا.

٢٠٧٢. کۆسە وە شوێن ریشا ئەگەڕێ.

٢٠٧٣. کۆسە و مار لە بن دار بە لە کۆسە مە لە مار.

٢٠٧٤. کۆڵەکە جمی بەغا رمی.

٢٠٧٥. کۆڵ و قورس و دڕکاوی، خەسوو تووڕە و ڕکاوی.

٢٠٧٦. کا ئەکا بە کێو.

٢٠٧٧. کابرایەك بیانووی بە خێزانی ماڵەوە دەگرت دەیویست تووشی شەڕی بکا، دەیگوت واوا لێهاتی ئارد ئەتەقێنی قن ئەلەقێنی.

٢٠٧٨. کاتێك کە دایك نەبێت، باوك ئەبێتە باوەپیارە.

٢٠٧٩. کار ئیمڕۆ مەخەرە شەوەکی.

٢٠٨٠. کار بێ وەستا حەرامە.

٢٠٨١. کار تۆشەی پشتە.

٢٠٨٢. کار تەواو نەکردن، وەسە میوەی کاڵ خواردن.

٢٠٨٣. کار پشتی نەشکێنی، پشتت ئەشکێنێ.

٢٠٨٤. کار پینە و پەڕۆ، ناگەیێتە نیمەڕۆ.

٢٠٨٥. کار سەختە وەلێ پوولەکەی شیرینە.

٢٠٨٦. کار شەو حەرامە.

٢٠٨٧. کار کار خاتوونە، ناو ناو مەیموونە.

٢٠٨٨. کارکردن خۆشە، وەڵی وە نەشە.

٢٠٨٩. کارکردن سەربەرزییە.

٢٠٩٠. کار کلیلی ئاسایشە.

٢٠٩١. کار لە بەرد نان درووست ئەکا.

٢٠٩٢. کاروان بەرایی ئایی نییە لە دوایی.

٢٠٩٣. کاروان بەرو دواس.

٢٠٩٤. کاروان بە رێگادا ئەڕوا سەو لە خۆیەوە ئەوەڕێ.

٢٠٩٥. کاروان وە وەڕین کاروان باوەڕ ناکا.

٢٠٩٦. کاروانێك پێشڕەوەکەی کەر بێت، ئەکەوێتە کەڵەنان.

٢٠٩٧. کاری بە پەلە خاوەنی شەلە.

٢٠٩٨. کاری گەن مەکە و لە خوا مەپاڕەوە.

٢٠٩٩. کارێزکەن کارێزی رووخا، وتی کێفەکانیش با بێن.

٢١٠٠. کارێکی خراپ هەموو کارە چاکەکان لە بەین دەبات.

٢١٠١. کاسە بە لە کاسە، مەکێشە هەناسە.

٢١٠٢. کاسە لە ئاش داخترە.

٢١٠٣. کاسە ها لە ژێر بڵووچەوە.

٢١٠٤. کاسەی پڕ ئاشتی ماڵە.

٢١٠٥. کاسەی ماڵ هاوسا دڵ گەرم ئەکا و سك تێر ناکا.

٢١٠٦. کاسەی هاوساماڵ یا دوای شێو دێ یا بەر لە شێو.

٢١٠٧. کا چوو، ما دانی.

٢١٠٨. کاغەز لەناو کەوانا دابنە.

٢١٠٩. کافرە کاکەسەن ئەرمەنی دڵ سەن، بووە تا بووە سوڵح لە دوای جەنگ.

٢١١٠. کاکەسەن و مامەسەن هەر یەکێکن.

٢١١١. کاکەم کاری کرد، ماکەرە جوانەکەی برد، نێرەکەرێکی هاوردە، قنی ئەیژی بەردە.

٢١١٢. کانی و ئاوەدانی.

٢١١٣. کاورا ئامەوی وێت سەگ بەر دریاکەشی خاسە.

٢١١٤. کاورا ئەترێ هاوساماڵ قسەی بۆ ئەکاتەوە.

٢١١٥. کاورا ئەرێ دوو ماڵی بێت لە برسیا ئەمرێ.

٢١١٦. کاورا ئەگەر نەهامەتی وێت، مانگاکەی لە قنەوە ئەزێت.

٢١١٧. کاورا ئەیژێ: وەختێ ئەخەفم ئاو ئەموا، وەختێ هەڵ ئەسم رەوی ئەخوا.

٢١١٨. کاورا دارێك بڕیاووە قنی، یەکێ‌تر ئەیوت تەقەی دێ.

٢١١٩. کاورا ژنی نەوێ لە خەما ئەمرێ.

٢١٢٠. کاورا سەرە و ژن کڵاو.

٢١٢١. کاورا شیر و برنج ئەخوا دەمی جوان نییە.

٢١٢٢. کاورا شێلآنە بۆ ناوکەکەی ئەخوات.

٢١٢٣. کاورا چارەوای نییە، زینەکەی ئەسێنێ.

٢١٢٤. کاورا گوو ناکا، ئەیژێ برسیم ناوێ.

٢١٢٥. کاورا قەرزیان پێ نەئەدا، ئەیوت شوکر قەرزار نیم.

٢١٢٦. کاورا لە دەشت هەوەتوودا، دەڵێ بێڵا با چارەواکەم غار دەم.

٢١٢٧. کاورای بێ ژن وەسە زمسان بێ بەفر.

٢١٢٨. کاورای برسی تا شەست تیکە جێگەی هەس.

٢١٢٩. کاورای تازە باڵق، هەمیشە دۆ هاوە قەویەو.

٢١٣٠. کاورای تووکن یا فرە کەرزۆرە یا فرە گانکەرە.

٢١٣١. کاورای دوژمن دایمە لیباسی دڕیایە.

٢١٣٢. کاورای شەوکار وەخت تەڕە گانی نییە.

٢١٣٣. کاورای گەوج کەم ئەخوات و فرە خەرج ئەکا.

٢١٣٤. کاورای عاقڵ گوێچکەی زلە، زووانی کوڵە.

٢١٣٥. کاورایان لە دێ رێ نەئەدا، وە شوێن ماڵ کەیخوا ئەگەڕا.

٢١٣٦. کای کۆن بە با مەکە.

٢١٣٧. کایە تاوێك خۆشە.

٢١٣٨. کەپەنك تەلآ، گۆچان مرواری.

٢١٣٩. کەر ئەسەرێنیٚ ئەیژن هەر ئەو هەوا ئەزانیٚ.

٢١٤٠. کەر ئەگەر وەتەڵەو وێت خۆی قەوچە قەوچ ئەکا.

٢١٤١. کەر ئەو کەرەسە لە بار نەترسیٚ.

٢١٤٢. کەر ببیٚ و کەر نەبیٚ بۆ خواڵێن[1] دەچی.

٢١٤٣. کەر بە بارەوە ئەخوا، ئەڵێ بەیتولماڵ حەرامە نەیخۆی.

٢١٤٤. کەر بە جۆ بمریٚ شەهیدە.

٢١٤٥. کەر بە سەرەسەرِ گوری تێرێتە سەر خۆی.

٢١٤٦. کەر بە کاروانی تێر ناخوا.

٢١٤٧. کەر بتۆپیٚ جلی بۆ چەس.

٢١٤٨. کەر بتۆپیٚ کەمای بۆ چەس.

٢١٤٩. کەر بچێتە دوور ئەوێتە پوور.

٢١٥٠. کەر ترِی باری شێویا.

٢١٥١. کەر ترِی جاشەکەر دەرپەرِی.

٢١٥٢. کەر ترِی کەڵەك شێویا.

٢١٥٣. کەر حەوسەڵەی نەو بسەرێنیٚ، ساحێوەکەی جەو گرتی.

٢١٥٤. کەر خۆمە و گوێچکەی ناڵ ئەکەم.

٢١٥٥. کەر زۆر و کۆپان کەم.

٢١٥٦. کەر زاییە و هۆڵیکەری بووە.

---

١ـ ناوی شوێنێك بووە کە خەڵك بە کەرەوە دەچوون خوێیان دەهاورد. مەبەست ئەوەیە کە پیاوی بیٚعەقڵ و گەلحۆ ئەگەر کەریشی نەبوایە دەچوو بۆ خواڵێن.

٢١٥٧. کەر زوانی نەوێت حەوشەکەی فرەس.

٢١٥٨. کەر شەغرەکێش دایمە هیلاکە.

٢١٥٩. کەر چووزانێ ئای نوقڵ و نەبات.

٢١٦٠. کەر چووە بەغا بووە هێسر.

٢١٦١. کەر گوێچکەی قوتەو کات، جنۆکە ها لەو پێشیەوە.

٢١٦٢. کەر فرە و شەغرە کەم.

٢١٦٣. کەر کۆن، هەوسار نەو، لووشکە لووشك لە دەور جۆ ئەکا.

٢١٦٤. کەر کۆن و هەوساری نوێ.

٢١٦٥. کەر کەوتە قوڕ، ساحێوماڵ بە ئەندازەی حەوت نەفەر لێی ئەنەوێ.

٢١٦٦. کەر کوڵ و بار سووك.

٢١٦٧. کەر لە ئاخر پیری تازە کورتان ئەبەسێ بە خۆیەوە.

٢١٦٨. کەر لە پۆس شێریشا ئەیناسن.

٢١٦٩. کەر لە جفتەی کەر تاڵ نابێت.

٢١٧٠. کەر لە کۆپان خۆی هەڵ نایەت.

٢١٧١. کەر لە کەر بێنێتەوە، گوێچکەی ئەوڕن.

٢١٧٢. کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە.

٢١٧٣. کەر مانوو، ساحێوماڵ ناڕازی.

٢١٧٤. کەر نە لەم دونیا نە لەو دونیایش نایوەخشن.

٢١٧٥. کەر وە بەفر بیسەنی لە قوڕا ئەخنکێ.

٢١٧٦. کەر وە تڕین دەرناوا.

٢١٧٧. کەر وە گوێچکەیا ئەناسێ.

٢١٧٨. کەر وە دەنکێ جۆ سەڕی تێ.

٢١٧٩. کەر وە کۆپانەوە نافرۆشن وەلـێ هەر ئەیژن گرانە.

٢١٨٠. کەر هەر ئەو کەرەیە، تەنیا کۆپانەکەی گۆڕیاوە.

٢١٨١. کەر کۆپان چارەوا کە ملیا، هەر کەرە.

٢١٨٢. کەرەکە مەمرە بەهارە، چووزەکەما دیارە.

٢١٨٣. کەرەکە مەمرە بەهارە، کۆپانەکە لە شارە.

٢١٨٤. کەرەکەوو چووە ماسیەر[1] بووە هێسر.

٢١٨٥. کەروێشك بۆ خۆی را ئەکا، تانجی بۆ خاوەنی.

٢١٨٦. کەروێشك لە هەموو جانەوەرێك ئەترسێ، قورباقیش لە کەروێشك.

٢١٨٧. کەروێشکەخەو ئەکا.

٢١٨٨. کەری دێز حەز بە تۆپینی خۆی دەکا و زەرەری خاوەنی.

٢١٨٩. کەریان لە کەماجارێکا وە یەکەوە لەوەڕیا.

٢١٩٠. کەریش لەناو گالا گەورەس.

٢١٩١. کەرێکی دا بە کەرێ، سنان لە بنا گوێی دەرێ.

٢١٩٢. کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ.

٢١٩٣. کەس کەس ناواتە بەهەشت.

٢١٩٤. کەس نەیخوران پشتی من، بێجگە لە نینۆکی ئەنگوستی من.

٢١٩٥. کەس وە بۆڵە نەمردووە.

٢١٩٦. کەسێ تەڵا فڕ با، مەجبورە مس جەمەو کا.

٢١٩٧. کەسێ ژنی بمرێ، ژنخۆشکی لە جێگا بێ.

---

١ـ ماسیەر گوندێکە لە ناوچەی خوڕخوڕەی سەقز.

٢١٩٨. کەسێ قسەی نەچوو تا بن گونی، حەقیە پێی بڵێن گەلێك کەمتر لە ژنی.

٢١٩٩. کەسێ کە خەریکە غەرق ئەوێت لە تەڕبوون ناترسێ.

٢٢٠٠. کەسێ کە ژنی نییە نابێت بێشکە بکڕێ.

٢٢٠١. کەسێ کە فیل پەروەردە ئەکا، فکریش بۆ دەروازەی گەورە ئەکا.

٢٢٠٢. کەسێ لە کەسێ هەڵبگرێ قینێ هەر خەوی گولی پێوە ئەبینێ.

٢٢٠٣. کەسێك ئازیەتبار بێت نابێ ساج لەسەر تەنوور دابنێ.

٢٢٠٤. کەسێك شەوانە پاتۆڵ لەژێر سەرینەکەی بنێت، دەڵێن خەو خراپ دەبینێ.

٢٢٠٥. کەسێك گورگ بتۆپێنێ بەد یومنە.

٢٢٠٦. کەسێك عەقلی پابەرجاوێ، ئامۆزا هەر وەك براوێ.

٢٢٠٧. کەسێك کە دڵی پاکە، زمانیشی پاکە.

٢٢٠٨. کەسێك کە شەرمی نییە، شەرەفی نییە.

٢٢٠٩. کەسێك کە کارێك نەکا، ئیشتبا و هەڵە ناکا.

٢٢١٠. کەسێك کە ژنی هەس دوژمنیشی هەس.

٢٢١١. کەشکە وژنگ خۆی ئەواتە دەما.

٢٢١٢. کەچەڵ ئەڕوات و پشت سەر خۆی ناوینێ.

٢٢١٣. کەچەڵ تیمارکەر بوایە، تیمار سەر خۆی دەکرد.

٢٢١٤. کەچەڵ پیاو هەمەوان نییە[1].

٢٢١٥. کەچەڵ جامی بۆ چەس.

٢٢١٦. کەچەڵ حەسەن و حەسەنە کەچەڵ هەر یەکێکە.

٢٢١٧. کەچەڵ خەنەی بۆ چییە خۆ سەر و پرژی نییە.

---

١ـ ناوی پارێزگایەکی ئێرانە.

٢٢١٨. کەچەڵ سەری بە تۆپەڵە ماس ئەشکێ.

٢٢١٩. کەچەڵ شەمامەی بەخەڵە.

٢٢٢٠. کەچەڵ عاری نییە، سەر خەڵك ئەداتە با.

٢٢٢١. کەچەڵ عەیبی بوێت، شەڕ خەڵکی وە لا ڕەشە.

٢٢٢٢. کەچەڵ لە ناو قوڕاوا دیارە.

٢٢٢٣. کەچەڵ هەر ئەونە زەحمەتە کڵاوەکەی داکەوێ.

٢٢٢٤. کەچەڵ هەم پرتەسێوی هەرەکە[1].

٢٢٢٥. کەل خەڵك بگرە تا کەلت بگرن.

٢٢٢٦. کەڵ لە کەڵ ئاوس نییە، کەر لە کەر ئاوسە.

٢٢٢٧. کەڵ وە وەتەن شەڕ ئەکا.

٢٢٢٨. کەلەڕەق وە حەق ئیعتنا ناکا، وەکوو بزمار چۆن بەرد کون ناکا.

٢٢٢٩. کەڵەشێر بخوێنێ مێوانمان دێ.

٢٢٣٠. کەڵەشێر پۆپەلار ساڵی دوو بەهار.

٢٢٣١. کەڵەشێر قووقانی، جووجەڵە نەیفامی.

٢٢٣٢. کەڵەشێریش نەبێت ڕۆژ ئەوێتەوە.

٢٢٣٣. کەلەکەم هەڵسا.

٢٢٣٤. کەم بخۆ هەمیشە بخۆ.

٢٢٣٥. کەم بژی کەڵ بژی.

٢٢٣٦. کەم تانەم لێبە من تانە کێش نیم، خۆ من وەك تۆ دەروێش نیم.

٢٢٣٧. کەم بخۆ و کز دانیشە.

---

١ـ واتە هەم داوای پرتەقاڵ دەکا و هەم داوای سێو.

٢٢٣٨. کەم خۆت تاڵ کە دێزەیەك ئەشکێنم وە شوێنتا.

٢٢٣٩. کەم خۆر و دایمە خۆر بە.

٢٢٤٠. کەم زان فرەوێژە.

٢٢٤١. کەم قسە بکە ئەیژی سپڵ لای گەۆی.

٢٢٤٢. کەمتر لە سك خۆت نان بخۆ.

٢٢٤٣. کەمتیار کوڕێکی چاکە، قولەپەی ئەسمێ دەنگ ناکا.

٢٢٤٤. کەمی تێنە و ورد بیجاوە، لەزەتەکەی ها لە دواوە.

٢٢٤٥. کەمی خۆت لە زۆری خەڵك باشتر بزانە.

٢٢٤٦. کەمی لێ بڵێ، زۆری لێ بزانە.

٢٢٤٧. کەنیشك دڵی وەسە قەورسان، هەرکە بڕوێتە ناوی نایێتە دەرەوە.

٢٢٤٨. کەنیشك عازەو وە بنەقوڵتە هێلکە ئەورژێنێ.

٢٢٤٩. کەنیشك عازەو وەك پێسەی سیراج وایە، لە خواری ماڵەوە داینێی سەگ دەیخوات، ئەگەریش لە ژوورەوەی ماڵەوە بێ، بۆگەن دەکا.

٢٢٥٠. کەنیشك وەسە داربەر هەرکە هەڵئەسێ برنەبێکی تێ ئەگرێ.

٢٢٥١. کەنیشکێ خاڵۆ تاریفی کا مەر خاڵۆزا بیخوازێ.

٢٢٥٢. کەنیلە لەتەك تۆمە وەویلە گوێت لێ بێ.

٢٢٥٣. کەو ئەو کەوەسە لە بەرانبەر کەوا بخوێنێ.

٢٢٥٤. کەو خۆخۆرە.

٢٢٥٥. کەو سەر ئەکاتە ژێر بەفرا وا ئەزانێ کەس چاوی لێوە نییە.

٢٢٥٦. کەو گەنم بەرەو خوارەوە بێت، دەڵێن گرانی و قات و قڕی پێش دێ.

٢٢٥٧. کەو هەمیشە بان بەردی پێ خۆشە.

٢٢٥٨. کەوا چەرمووی بەر لەشکر.

٢٢٥٩. کەوش تاوەتا پیاو گەوج ئەکا.

٢٢٦٠. کەوش پۆتین هاڕەی تێت، زك برسی قاڕەی تێت.

٢٢٦١. کەوش پشت پا ئەگرێ، کچ شوێن دایك خۆی ئەگرێ.

٢٢٦٢. کەوش سوار بوێت، سەفەر ئەکەوێتە بەرم.

٢٢٦٣. کەوش کڵاش لەپا، کوڕ عەلاحەزرەت، ئامۆزاکەی شا.

٢٢٦٤. کەوش لە خەوا تەنگانە دێنێ.

٢٢٦٥. کەوشەکانت بەرەو خوارەوە بێت دەڵێن خۆشەویستت لێ ئەمرێ.

٢٢٦٦. کەوچك خە دەمی تەقەی نایێ.

٢٢٦٧. کەوچك کەیوانوو تەقەی نایێ.

٢٢٦٨. کەوچکی خۆت بە خەڵك مەدە، خۆیشت بە دەست نان مەخۆ.

٢٢٦٩. کەی تۆ ژنت هاورد من حەزم نەکرد، شایانەکەت نارد چۆپییەکەم نەگرد.

٢٢٧٠. کەی ماسی لە ناو بەحرا لە تینیا خنکاوە.

٢٢٧١. کراس لە خۆم، پاتۆڵ لە خۆم، بێ بمگێ وەخێری خۆم.

٢٢٧٢. کراسەکەم دڕیا قۆڵم کەفتە دەر، وە رۆژە رۆژە ساڵم بردە سەر.

٢٢٧٣. کراسیان لەبەر خۆرێکا وشك ناوێتەوە.

٢٢٧٤. کراسێك بە پاکی بیدڕی، باشترە لە سەد کراسی کەسیف.

٢٢٧٥. کردەی ئێمە و بردەی ئەو.

٢٢٧٦. کردەی ئێمە و بردەی شەیتان.

٢٢٧٧. کشەکشە پۆپەڕەشە، میوان شەوێك و دووان خۆشە.

٢٢٧٨. کچ خۆی مەیلی بوێت ماڵ مەلای بۆ چەس.

٢٢٧٩. کچ شەرم بکا شارێکە، کوڕ شەرم بکە شانەیەکە.

٢٢٨٠. کچ من وابیێت وە پەل ئەمفرۆشت.

٢٢٨١. کچ وەکوو پردە هەمووان پێیدا دەڕۆن.

٢٢٨٢. کچێکی بەختەوەر لەماڵی مێرددا.

٢٢٨٣. کۆڵە بسووتێنی لە تەنوور دەڵێن گورگ لە مەڕتان ئەدا.

٢٢٨٤. کڵاوێ ئاو بیوا، وەسەر ساحێوی زلە.

٢٢٨٥. کڵاوم لە راستی دڕاوە.

٢٢٨٦. کلیل بۆ حەڵاڵزادە لـێ ئەدرێ.

٢٢٨٧. کوای گرد خاسە تا کوای بڵاو.

٢٢٨٨. کوڕ بۆ باوکی بەقای نییە.

٢٢٨٩. کوڕ بامە، کوڕەزایش ناوەکە بامە.

٢٢٩٠. کوڕ خۆم نییە کوڕ دەروێشە، حەوت مانگانەو شەغرەکێشە.

٢٢٩١. کوڕ خاس ماڵ ئەڕای چەس، کوڕ خراو ماڵ ئەڕای چەس.

٢٢٩٢. کوڕ خوا.

٢٢٩٣. کوڕ نییە، وجاخ کوێرەوکەرە.

٢٢٩٤. کوڕ وە ماڵ باوک خۆیا ئەنازێ بۆ خۆی بفامێ و خانە بسازێ.

٢٢٩٥. کوڕ فەقیر ئەوێسێ تا ئارد لە ئاسیاو بێتەوە، کوڕ دەوڵەمەن ناوێسێ تـا کـولێرە لـە تـەنوور ئەوێتەوە.

٢٢٩٦. کورد ئەگەر دەوڵەمەند بێت یا ژن ئەهێنێ یا شەڕ ئەکات.

٢٢٩٧. کورد بەلەجەڕ[1] بەرماڵ وێل ئەکەن و پشت ماڵ ئەگرن.

---

١ـ ناوی گوندێکە لە دەوری سەقز.

٢٢٩٨. کورد خۆخۆرە.

٢٢٩٩. کورد دەڵێن: ژن و ماڵ.

٢٣٠٠. کورد رۆن فرەی بوێت، قن خۆی پێ چەور ئەکات.

٢٣٠١. کوردێك و گۆرانێ شەڕیانە لەسەر ماڵ موسوڵمانێ.

٢٣٠٢. کوڕم کوڕمە تا کاتی ژن هێنان، کچم کچمە تا بە درێژی ژیان.

٢٣٠٣. کوڕی کەر هەر کەرە.

٢٣٠٤. کۆسە و مار لە بنەدار، بکوژە کۆسە، مەکوژە مار.

٢٣٠٥. کوڵە تڕی بەش خۆی بڕی.

٢٣٠٦. کولێرە و نان بۆ زك پاشا تا کوڕێکی بێت بۆ تماشا.

٢٣٠٧. کولێرەی شەمسە ئەخوات و شەغرە بۆ جونیان[1] ئەکێشێ.

٢٣٠٨. کوێر بە لایەوە وایە چاودارەکان چوارچوار دەخۆن.

٢٣٠٩. کوێر چاوی لە عەیب خۆیەوە نییە.

٢٣١٠. کوێر نیت و شماقی[2] بوێنە.

٢٣١١. کوێر هەتا ئەمرێ وەتەمای چاوە.

٢٣١٢. کوێرە چیت دەوێ دوو چاوی ساغ.

٢٣١٣. کوێرەکانی مەکە وە باخ، بۆی هەڵمەکێشە ئاخ و داخ.

٢٣١٤. کوێری باشترە لە نەزانی.

٢٣١٥. کیسەڵ ئەویە خراپە دەندە عەقەبی نییە.

٢٣١٦. کیسەڵ دەعوەت بوو بۆ زەماوەن، وتی نە دیان خواردنم هەس نە پای هەڵپەڕکێ.

---

١ـ شەمسە و جونیان دوو گوندن لە تەنیشت یەك لە ناوچەی تیلەکۆی سەقز.

٢ـ مەبەست رواڵەت و زاهێرە.

٢٣١٧. کیسەڵ لە خوار درەوانەوە ئاو ناخواتەوە.

٢٣١٨. کیسەی سواڵکەر قەت پڕ نابێ.

٢٣١٩. کێچی بە نرخ گا ئەڕوا.

٢٣٢٠. کێفەکان با ئەیوات، کورەکە کەمایان ئەدا بەری.

٢٣٢١. کیفەی مار ئەهات لە موغارەوە، سایەی زەنگ ئەهات لە هەرزاڵەوە.

٢٣٢٢. لۆتی تا ترِن وێت سەیری خۆشترە.

٢٣٢٣. لۆتی کە بێ پارە کەوت، نان و پیاز دەخوا.

٢٣٢٤. لارەلارمە، تەرسەقول بارمە.

٢٣٢٥. لاس بکە مل قنیا بیکە ناو گاێل.

٢٣٢٦. لافاو لە تکە تکەی باران هەڵئەسێ.

٢٣٢٧. لانەی مریشك مەگۆڕە.

٢٣٢٨. لای خوا پاکم لای بەنەی خوا بێ باکم.

٢٣٢٩. لای قازی و زوانبازی.

٢٣٣٠. لە ئادەم ناوێ، لە شێر پۆسێ ئەمێنێ.

٢٣٣١. لە ئاسایشدا ئەوەندە دۆست بگرە لە تەنگانەدا پێیان را بگەی.

٢٣٣٢. لە ئاسیاوا فرەی پێ ئەچێ لە ریا قەرەوی ئەکاتەوە.

٢٣٣٣. لە ئاو خوڕ مەترسە لە ئاو مەن بترسە.

٢٣٣٤. لە ئاو شەو پارێز ئەکات.

٢٣٣٥. لە ئاو کەرە ئەگرێ.

٢٣٣٦. لە ئاو لێڵ ماسی ئەگرێ.

٢٣٣٧. لە ئاو نەهاتوو، قولی هەڵکردووە.

٢٣٣٨. لە بێخەوەران کەشکەك سەڵەوات.

٢٣٣٩. لە بان ئاو ئاور ئەکاتەوە.

٢٣٤٠. لە بانەو زەوقە لە خوارەو تەوقە.

٢٣٤١. لە بەڕان بەڕان هیچمان کەم نییە، چ سفرە دادەخەین نانی تیا نییە.

٢٣٤٢. لە بەرەو ئەترِێ لە دواوە قن ئەقونجێنێ.

٢٣٤٣. لە بەرەو باجی لە پشتەو قەیچی.

٢٣٤٤. لە بەرەو بوێسێ قەپ ئەگرێ، لە دواوە بوێسێ لەقە ئەخا.

٢٣٤٥. لە برسیا مردن لە ماڵ هەتیم خواردن باشترە.

٢٣٤٦. لە بناوانەوە ئاو هەڵکە.

٢٣٤٧. لە بیاوانا کەوشە کۆنێك نیعمەتە.

٢٣٤٨. لە تاو ئاگرا خۆم خستە ناو ئاو.

٢٣٤٩. لە تەڕ ئەخوات و لە وشك ئەترِێ.

٢٣٥٠. لە تەك بایشا شەڕ ئەکا.

٢٣٥١. لە تەك خەڵکا وە ئەندازەی عەقڵیان قسە بکە.

٢٣٥٢. لە تەك سێوەر خۆیا خەریکە شەڕ ئەکا.

٢٣٥٣. لە تەك گورگا گۆشت ئەخوا لە تەك شوانا شیوەن ئەکا.

٢٣٥٤. لە تەك قەڵەڕەش کردم دەسبازی، هێشتا قەلە رەش وە من ناڕازی.

٢٣٥٥. لە تەك کوێرا نان ئەخۆی، خوای خۆت وە حەق بناسە.

٢٣٥٦. لە ترِی لۆتی سازترە.

٢٣٥٧. لە تیری خۆی قاز ئەجاوێ.

٢٣٥٨. لە پاییز بترسە زستان بە دوایا دێ، لە زستان مەترسە بەهار بە دوایا دێ.

٢٣٥٩. لە پڕێ، ناویتە کوڕێ.

٢٣٦٠. لە پیرێ پەندێ لە خەسارێ عەقڵێ.

٢٣٦١. لە پێشخانا گەورە بوویتە.

٢٣٦٢. لە جێگای گوڵ، گوڵ دەڕێتەوە لە جێگای توورك، توورك.

٢٣٦٣. لە جێگایێ دانیشە کە خۆر لێت با نەوەکوو سپێ.

٢٣٦٤. لە جێگاییێکدا مەلا نەبێت، کەڵەباب دەبێتە بلقاسم.

٢٣٦٥. لە جێگاییێکدا تف کەرەوە خەڵك بێزت لێ نەکاتەوە.

٢٣٦٦. لە حەوت ئاوی داوە، قولی تەڕ نەبووە.

٢٣٦٧. لە حەیوەت بێ‌کەسی، وەیسەی[1] کردە کەس.

٢٣٦٨. لە حەیوەت گێرە بوومەتە وشتر.

٢٣٦٩. لە خۆت رازی ویت زوو ئەشکی.

٢٣٧٠. لە خۆشیا پلە زیقانیە.

٢٣٧١. لە خۆشیا هەر وردەتڕ ئەداتەوە.

٢٣٧٢. لە خۆی ئەگرێتەوە بۆ منالێ.

٢٣٧٣. لە خوا شەرمی نییە، لە بەنە چۆن شەرم ئەکا.

٢٣٧٤. لە داخ هاوساماڵ ئەچوو قن خۆی ئەدڕی.

٢٣٧٥. لە دەسی بەرد هەڵ ئەگەڕێنێتەوە.

٢٣٧٦. لە دەشتەو بڕبڕانیە، لە ماڵەو سەو پاسووتیاوە.

٢٣٧٧. لە دەشتەو بیگلەریەگی، لە ماڵا وە حاڵ سەگی.

٢٣٧٨. لە دەم شێر ئەدا.

---

١ـ ناوی پیاوێکی زۆر بێ‌دەسەڵات و بێ‌لیاقەت بوو، واتە نە بەکاری خۆی هاتووە و نە خزم و کەسەکانی.

٢٣٧٩. لە دەورەی ئەسحابان کوڕ گەورەتر لە بابان.

٢٣٨٠. لە دژومن بترسە ئەگەر مێروولەیەك بێت.

٢٣٨١. لە دز وایە هەموو کەس دزە.

٢٣٨٢. لە دوای تاریکی رووناکیە.

٢٣٨٣. لە دوای ترِێ خەمشە ئەوڕێ.

٢٣٨٤. لە دوای شاوازان کۆرکۆرە وازان.

٢٣٨٥. لە دوای چلەگەورە قەد بەهار نایەت.

٢٣٨٦. لە دوای عومرێ شوانی، نازانێ کەی شەوی جومعەیە.

٢٣٨٧. لە دوای مردن هەر رەحمەت باشە.

٢٣٨٨. لە ژیان بترسە لە مەرگ مەترسە.

٢٣٨٩. لە ژێر پام گیا سەوز بوو.

٢٣٩٠. لە ژێر لێفەی باوك خۆیا نەخەوتە.

٢٣٩١. لە رادەبەدەر عاقڵ بوون کارێکی عاقڵانە نییە.

٢٣٩٢. لە رووی جیهانا پاك بە، ئەوسا بێ باك بە.

٢٣٩٣. لە رێگای راسا، کەس گوم ناوێ.

٢٣٩٤. لە رێگەی بۆرەپیاوا خۆت بدەی بە کوشت، ئەیژێ لە رێگەی خوا مرد.

٢٣٩٥. لە رێی راسا نەی ئەتوانی بڕوا، لە ناو شێفا پشتەکی لـێ ئەدا.

٢٣٩٦. لە زاهیرا ئەیژێ دەوڵەمەنە، لە باتنا وەقەو شارێ بەدبەختە.

٢٣٩٧. لە زستان دەستێ جل باشترە لە چەپکێ گوڵ.

٢٣٩٨. لە زك خاڵی چی هەڵپەڕم.

٢٣٩٩. لە زمسانا بڤە و لەرزە، لە تاوسانا پەتك چەو لەتك چە.

٢٤٠٠. لە زوان مار ئەزانێ.

٢٤٠١. لە زوان مەل و مۆر ئەدوێ.

٢٤٠٢. لە سۆڵا گاییا لە ئیساقئاوا[1] حەق خۆی ئەسێنێ.

٢٤٠٣. لە سێ شت ئەبێ پارێز کەین، دیوار رووخاو، گەماڵ دوڕ، ژن تەنیا.

٢٤٠٤. لە سەر ماڵم دای لە باڵم.

٢٤٠٥. لە سەورە رۆیشتن مەترسە لە وێسانن رێگە بترسە.

٢٤٠٦. لە شاری کوێران دەست بە چاوتەوە بگرە.

٢٤٠٧. لە شام لێ ئەدا لە شیراز دەری ئەکا.

٢٤٠٨. لە شوێنێك دانانیشێ کە ژێری تەڕ بێت.

٢٤٠٩. لە شیرینی خۆیا تڵیشی بردە.

٢٤١٠. لە چارەوا داوەزی، سوار کەر بوو.

٢٤١١. لە چاو ژن دوو فرمێسك دێتە خوار، یەکێکیان هین خەمە، یەکێکیان هین فریوە.

٢٤١٢. لە چاوم هەڵات لە برۆشم هەڵبێت قەینا.

٢٤١٣. لە چەمی وشك ماسی دەگرێ.

٢٤١٤. لە گۆشت مەلێك هەر یەك پەلێك.، لە گۆشت گایێك چی بەمە برایێك.

٢٤١٥. لە گەورەیی خوا لە گەوجی تۆ.

٢٤١٦. لە فەقیر ئەپرسن ئەیژێ کەی هاویتە فکرمانەوە، ئەیژێ هەر وەخت خوام لە بیرەو بچێ.

٢٤١٧. لە قالاوەڕەشەدا چەرموو هەس تا لە باوەژندا بێت.

٢٤١٨. لە قەدیمەوە وتوویانە: خۆزگا گوری لە پاڵ مەڕا ئاوی بخوارداییێتەوە.

٢٤١٩. لە قنەو لەغاوی کردە.

---

١ـ سۆڵە و ئیساقئاوا ناوی دوو گوندن لە سەرشیوی سەقز کە لەتەنیشت یەك هەڵکەوتوون.

٢٤٢٠. لە قوشرەو هینامان لە عوشرەو دەرمان کرد.

٢٤٢١. لە کاتی دەردی تەنانەت مەرگدا، ددان بگرە بە جەرگدا.

٢٤٢٢. لە کاتێکدا هەڵپەڕی، تڕ لە قنیا دەپەڕی.

٢٤٢٣. لە کاری خراپا یا نەزان بە یا خۆت بکە بە نەزان.

٢٤٢٤. لە کەسی باوکم هەر تۆم بۆ ماوی.

٢٤٢٥. لە کڵەی قازان بەش خۆی دەرتێڕێ.

٢٤٢٦. لە کیسەی خەڵیفە ئەبەخشێ.

٢٤٢٧. لە کیسەی خەڵیفە بدزیت ئاوقەو شەڕ ئەویت.

٢٤٢٨. لە لای ئاسنگەر دامەنیشە تا پزووسك نەتسووتێنێ.

٢٤٢٩. لە ماڵ خەڵکی شامەردە لە ماڵی خۆی نامەردە.

٢٤٣٠. لە ماڵ زاوا هیچ نییە لە ماڵ بووك تەقە و تورمە.

٢٤٣١. لە ماڵ مەردم شامراوئاغاس لەماڵ خۆیا نامراوئاغاس.

٢٤٣٢. لە مەندەڵی شا فرەس.

٢٤٣٣. لە مردوو گۆرانی نابیسی.

٢٤٣٤. لە مردوویێك زیندوویێك ئەکەوێتەوە لە زیندوویێکیش مردوویێك ئەکەوێتەوە.

٢٤٣٥. لە من عەرز و لە تۆ گەز.

٢٤٣٦. لە من منەت لە تۆ شفەت.

٢٤٣٧. لە ناعیلاجی سەر بە ماڵی دوژمندا ئەکا.

٢٤٣٨. لە ناڵیش ئەدا و لە بزماریش.

٢٤٣٩. لە ناو ئەم دەستە موویێك دەرهێنە.

٢٤٤٠. لە ناو کا بۆ دەرزی ئەگەڕێ.

٢٤٤١. لە نەتاشیاو کاورا بۆ هاوساکەی ئەتاشێ.

٢٤٤٢. لە نەو کیسە قەرز مەکە، قەرز ئەکەی خەرجی مەکە.

٢٤٤٣. لە وەخت شەڕا فکری ئاشتی بکەوە.

٢٤٤٤. لە وەخت کەل و کار ئەمانکەنە یار لە وەخت چز و بز ئەمانکەنە دز.

٢٤٤٥. لە وەخت نانخواردنا گشتیان جەم ئەبن لە وەخت کارا گشتیان گوم ئەبن.

٢٤٤٦. لە ورچێ موویێك ئەکەنێتەوە.

٢٤٤٧. لە هوویێ، موویێ ئەکەنێتەوە.

٢٤٤٨. لە هار مەترسە لە فەقیر بترسە.

٢٤٤٩. لە هارەی دایەنی، جاشەکەر ئەخاتە تەنوور.

٢٤٥٠. لە هەرچی ئاشە، کەچەڵ فەڕاشە.

٢٤٥١. لە هەرچی هەورە باران ناوارێ.

٢٤٥٢. لە هەزار دۆستی بە دەم دۆست، یەکێکان لە رۆژی تەنگانەدا بە هاوارتەوە نایەن.

٢٤٥٣. لە هەچی کاسا کەوچکە.

٢٤٥٤. لە هەوانەی خۆیەوە گوێز ئەژمێرێت.

٢٤٥٥. لەبەر خاتر خاتران وە گوو نایژم زەعفەران.

٢٤٥٦. لەبەر خاتری خاتران ئەچێتە سەر دینی کافران.

٢٤٥٧. لەزەت دنیا ژن و دیانە، بێژنی و بێدیانی جیهان زیندانە.

٢٤٥٨. لەسەر حەق پا دامەکێشە بۆ ناحەق.

٢٤٥٩. لەسەر رێگا گوو مەکە با خەو هاشەوپاشە نەبینیت.

٢٤٦٠. لەسەر رێگا مەخەوە، خەو خراویش مەوینە.

٢٤٦١. لەسەر کوانوویێك بەش کریاوین.

٢٤٦٢. لە سەرەمەرگا پی بێژە «یا اللە» ئەیژێ ئابە دەتمەن لە رێی خوا.

٢٤٦٣. لەش‌ساخی تەخت پاوشاییە.

٢٤٦٤. لە شەك و بێشا.

٢٤٦٥. لەچك بێ مێخەك ناوێت بۆ دیاری.

٢٤٦٦. لە گ هەورێك باران نابارێت.

٢٤٦٧. لەگەڵ کەدخودا بسازە ئاوایی بقاپە.

٢٤٦٨. لەگەڵ نائەسڵان هیچ فەسڵان، لەگەڵ ئەسڵان هەموو فەسڵان.

٢٤٦٩. لەگەڵ نائەسڵا مەچۆ بۆ کایە، رەنجی چەند ساڵەت ئەدا بە زایە.

٢٤٧٠. لەگەڵ یەکتر کەر و خۆڵەمێشین.

٢٤٧١. لەقەی مانگا ئێشی نایێ.

٢٤٧٢. لەکار خێرا عەجەلە بکەی خاسە.

٢٤٧٣. لە کەم کەم ئەکوژێت و لە فرە فرە.

٢٤٧٤. لەناو سوارکاران بۆرە پەسەن، بۆرە داو نییە نۆرەی حەسەنە.

٢٤٧٥. لەو جێگا کە عەقڵ هەیە ترس رێگای نییە.

٢٤٧٦. لەوە بترسە وا ئەیژێ من هیچ ناخۆم.

٢٤٧٧. لووت لە بەین چاوا نەوێت، چاو چاو ئەخوا.

٢٤٧٨. لوولەی تفەنگ رەش ماڵمانی کرد سێ بەش.

٢٤٧٩. لیباس دوو هێوەرژن لە تەشتێکا ناشۆرییێت.

٢٤٨٠. لێفەم وەسەر هەتیمەوە لا نەبردە.

٢٤٨١. لێم ئایەنە، جێم کایەنە.

٢٤٨٢. لێم بوەسە سوور چاوکاڵ، زۆڵێ چەرم لەناو شانم ئەکەنێتەوە.

٢٤٨٣. ماتە، وە منالی داتە.

٢٤٨٤. مار ئەکوژێت و بەچکەمار بەخێو ئەکات.

٢٤٨٥. مار تا بەچکەمار نەخوا ناوێتە ئەژدیها.

٢٤٨٦. مار تا راس نەبێتەوە ناچێتە کونەوە.

٢٤٨٧. مار خۆشی لە سیر نەئەهات لە بەر کونەکەیا سەوز ئەبوو.

٢٤٨٨. مار دەس و پای نییە ماڵ لە مشك داگیر ئەکا.

٢٤٨٩. مار سەری لە ئاوا وێت مەیکوژە.

٢٤٩٠. مار لە خەودا زوانە (یانی ناوتیان بردووە).

٢٤٩١. مارت لە دەس خەڵکا وێت، ماڵت ماڵ خۆت وێ.

٢٤٩٢. مارەیی ژن یەك باوش گسکە.

٢٤٩٣. مارم لە باخەڵ خۆما وەخاوەن کردە.

٢٤٩٤. مازوو برای گۆراوزوو.

٢٤٩٥. ماس تا نەیژەنی کەرە نادات.

٢٤٩٦. ماس نییە وە لای دەمتەوە دیار بێ.

٢٤٩٧. ماسی بۆ لای قولاپ کەسێك ئەچێ کە سەوری بێت.

٢٤٩٨. ماسی زۆر قسەی پێیە بەڵام دەم بکاتەوە دەمی پڕ دەبێ لە ئاو.

٢٤٩٩. ماسی لەناو ئاوا دایمە ناوسکی رەشەو بووە.

٢٥٠٠. ماسییەکان خواردنی داوی قولاپەکە دەبینن کەچی قولاپەکە نابینن.

٢٥٠١. ماقوولی جێگە بە ماقوولی دانیشتووەکانیەتی.

٢٥٠٢. ماکەر چ دەربایسە نێرەکەر قنی بدڕێ.

٢٥٠٣. ماکەر ماڵ وەپا کەر، نێرەکەر ماڵ وێرانکەر.

٢٥٠٤. ماکەر مەلە ئەکا.

٢٥٠٥.ماڵ بێ دیانە.

٢٥٠٦. ماڵ بێ چرا و خۆیشك بێ برا.

٢٥٠٧. ماڵ بێکۆڵەکە ناوێت.

٢٥٠٨. ماڵ باوکت کای سەر ملە وێت.

٢٥٠٩. ماڵ بە پاسارە، کەر بە هەوسارە.

٢٥١٠. ماڵ پیاوی نەبێ ژن سەرگەردانە، ژنی تیا نەوێت ماڵیش وێرانە.

٢٥١١. ماڵ حەرام وە قسمەت کەس ناوێت، ماڵ حەلاڵیش گوم ناوێت.

٢٥١٢. ماڵ حەلاڵ باریك ئەوێت بەلاّم ناوڕپێت.

٢٥١٣. ماڵ حەلاڵ نابڕپێت، ببڕپێت شوێنی گوم ناوێت.

٢٥١٤. ماڵ خۆ نەخۆر بۆ چەکمە بۆر.

٢٥١٥. ماڵ خۆم ئەخۆم، ماڵ تۆیش وەك هەڵوا ئەخۆم.

٢٥١٦. ماڵ خەزوورەی وە قن دریای پێ ئەکەنەوە.

٢٥١٧. ماڵ دنیا قەزاوەگەڕین.

٢٥١٨. ماڵ دنیا وەسە چلك دەس.

٢٥١٩. ماڵ زیاو سەر ناشکێنێ.

٢٥٢٠. ماڵ سپی بۆ رۆژی رەش.

٢٥٢١. ماڵ شێوەی ساحێوماڵ ئەدا.

٢٥٢٢. ماڵ گەلەکوزان، ئاو نییە لە گۆزا.

٢٥٢٣. ماڵ گەن بۆ ساحێوی ئەگەڕێتەوە.

٢٥٢٤. ماڵ فرەکەیوانوو یا نانەکەی سۆڵ ئەبێت یا چێشتەکەی.

٢٥٢٥. ماڵ فرەکەیوانو هەرکی هەرکییە، کاسەی کەم و کەوچکی نییە.

٢٥٢٦. ماڵ قەڵب سەر وە خاوەنی.

٢٥٢٧. ماڵ لە خۆیا نەوو میوان رووی تیٚ دەکا.

٢٥٢٨. ماڵ لەلای ماڵ وێت، خاوەن ماڵ لەلای جێویان وێت.

٢٥٢٩. ماڵ مفتە بیە بەر جفتە.

٢٥٣٠. ماڵ نەگەییە هەوار، سەگ گەیشتە سێوەر دار.

٢٥٣١. ماڵ وە ماڵ، ساڵ وە ساڵ.

٢٥٣٢. ماڵ وە جێگەیێك ئەڕوا، ئیمان وە هەزار جێگا.

٢٥٣٣. ماڵ وە دیوارەوە خۆشە.

٢٥٣٤. ماڵ وە مێوانەوە خۆشە.

٢٥٣٥. ماڵ هالە باهۆی کوڕا.

٢٥٣٦. ماڵ ماڵ منە و ماڵئاوایی جەلیل.

٢٥٣٧. ماڵێ یەخ وێت، بنەڕەتی ئەوێتە ئاو.

٢٥٣٨. ماڵت ئاوا وێت کەنیشکت بووك و کوڕت زاوا وێت.

٢٥٣٩. ماڵت بووێت وە سەر ماڵ خەڵکا مەپەرژە.

٢٥٤٠. ماڵەکە هەزار ماڵت لێ کەوێتەوە.

٢٥٤١. مالك نازانێ، خالق ئەزانێ.

٢٥٤٢. ماڵم ماڵ نەوێ، بازاڕم بازاڕ وێت.

٢٥٤٣. ماڵمان نەبووە بە ماڵ، زەماوەنیشی تێکەوت.

٢٥٤٤. ماڵو لە کەناوا بێت، ساحێوماڵ وەلایەوە بێ.

٢٥٤٥. ماڵو برمێ شەلەم بۆ قوڵتەت.

٢٥٤٦. ماڵی بێحەوشە وەسە ژن بێدەرپێ.

٢٥٤٧. ماڵی بێژن وەکوو پیری بێ دەوڵە.

٢٥٤٨. ماڵی رخیاو، ژنی خراو.

٢٥٤٩. ماڵی زۆر، دینی کەم.

٢٥٥٠. ماڵێك کە ژنی تیا نەوێت وەك چاڵە ئاوێکە کە سەتڵی تیا نەوێت.

٢٥٥١. ماما بووە دووان منداڵ کوێر تێتە دونیا.

٢٥٥٢. مامان فرە وێت سەر منداڵ لار ئەوێت.

٢٥٥٣. مامە خانە کاری بۆ خۆی ئەکرد، منەتی وە مل خەڵکا ئەکرد.

٢٥٥٤. مامە خەمە، خەمخۆرە.

٢٥٥٥. مامە مامە، شایی و شیوەن دەسەوامە.

٢٥٥٦. مامر ئەخۆن لەگەڵ کەڵەشێر، ئەونە چاخن وەنە خرتە نێر.

٢٥٥٧. مامر خۆی خۆڵ بەسەر خۆیا نەکات، کەس خۆڵ بە سەریا ناکات.

٢٥٥٨. مامر خۆی وە لەپەوە لێ نا.

٢٥٥٩. مامر شەو وە خەیاڵ خەرمان ئاوبردووەوە ئەخەفێ.

٢٥٦٠. مامر گرتی سەرچۆپی کەڵەشێر لە داخا تۆپی.

٢٥٦١. مامر هەنجیر خۆر دەنووکی لارە.

٢٥٦٢. مامر هێلکەیش ئەکا و ریقنەیش.

٢٥٦٣. مامر هێلکەکەر لە سەد گای جووت نەکەر باشترە.

٢٥٦٤. مامرە رەش هێلکە ناکا و مارەکەیش دەخوا.

٢٥٦٥. مامرە سوورەی مەریوان، خۆشخۆش ئەچوو بۆ دیوان.

٢٥٦٦. مانگ سەفەر ناوی بەدناوە.

٢٥٦٧. مانگ چ لە جێوە چ لە جێی هەسارە.

٢٥٦٨. مانگ کامڵ فەقەت راییك ئەوینییێت.

٢٥٦٩. مانگ لە خۆی جوانە.

٢٥٧٠. مانگا ئەوەسییێتەوە کەڵەگا ناوەسییێتەوە.

٢٥٧١. مانگا بە دزیەوە کەڵ ئەگرێت بە ئاشکرا ئەزێت.

٢٥٧٢. مانگا دۆشین و قەزوان خواردن.

٢٥٧٣. مانگا دەمی هەمارە و قنی پاکوتە.

٢٥٧٤. مانگا شایەد رەش بێت بەڵام شیرەکەی هەر سپییە.

٢٥٧٥. مانگا مردوو بڕیا دۆ.

٢٥٧٦. مانگای بێوڵەت شیر ئەدا وەلێ لە ئاخرا لەقەیێکی لـێ ئەدا و ئەیرژێنێت.

٢٥٧٧. مانگو لێوە دیار وێت با ئەستێرە هەر زریوەی لێوە بێت.

٢٥٧٨. ماین و هێسر شەڕیانە، کتە لەڕە تیا ئەچێ.

٢٥٧٩. مایین ترن کوڕی فیڕنی ئەوێت.

٢٥٨٠. مەلە سەری سەلارە بە لە قونی خەتاکارە.

٢٥٨١. مەپرسە لە کراس سوورە، بپرسە لە باو و باپیرە.

٢٥٨٢. مەڕ پای بەرخ خۆی ناشکێنێ.

٢٥٨٣. مەڕ پشکەڵ ئەکا و ژن قن هەڵ ئەتەکێنێ.

٢٥٨٤. مەڕ دووی خۆی وە گوری ئەسپێرێ.

٢٥٨٥. مەڕ رۆن ئەکا، ژن خۆی هەڵ ئەکا.

٢٥٨٦. مەڕ رەش لە گوێی کەڵەنان.

٢٥٨٧. مەڕ گوێ تەپێ بکا باران دەبارێ.

٢٥٨٨. مەڕە ڕەشە هێلکە گوان ڕەشە، شیری ئەپەڕێ بانە و بان.

٢٥٨٩. مەڕە ڕەشی موکری، نە شیری هەس نە خوری.

٢٥٩٠. مەرد بۆ ناو ئەمرێ، نامەرد بۆ نان.

٢٥٩١. مەردم ڕەش مەکە با ڕەشت نەکەن.

٢٥٩٢. مەرگ خاسە وەلێ بۆ هاوساماڵ.

٢٥٩٣. مەرگ لە تەك هاوماڵا خۆشە.

٢٥٩٤. مەڕمان نەدیوە، پشکەڵمان دیوە.

٢٥٩٥. مەڕ و چارەوا لە خەوا فریشتەیە.

٢٥٩٦. مەشوەرەت لە تەك ژنا تەباهە لەگەڵ موشرکا گوناحە.

٢٥٩٧. مەگەر گیای بەهارە سەوز ببێتەوە.

٢٥٩٨. مەغز کەری خواردە.

٢٥٩٩. مەقەڵ سپێ خستیوی، ئەیوت من و ئاغە ڕەزا وە شەوێك بووینە لە دایك.

٢٦٠٠. مەکەفە بەرەوە ئەیژی گۆچان حافزی.

٢٦٠١. مەکر ژنان، بار خەران، غەر نەوەران، قوڕ وە سەران.

٢٦٠٢. مەل وە باڵێ نافڕێ.

٢٦٠٣. مەلا سوار کەر بوێت تا نەیتۆپێنێ داناوەزێ.

٢٦٠٤. مەلا گووی سۆح ناکا ئەو لە خەو هەڵئەسێ.

٢٦٠٥. مەلا لە مزگەوتیش سەهو دەکا.

٢٦٠٦. مەلا لە مزگەوت شەلەمئاو ئەخوات.

٢٦٠٧. مەلا وە ڕۆژەووە فڕووجاو ئەخوا.

٢٦٠٨. مەلای فرەوێژ ئیشتبایش ئەکا.

٢٦٠٩. مەلەم فێر کرد، ئیسە ئەمخنکێنێ.

٢٦١٠. مەلینچك خۆی چەس تا کەلەوپاچەی چە وێ.

٢٦١١. مەلینچەك کۆر خوا هێلانەی بۆ درووست ئەکات.

٢٦١٢. مەلینچك لە پەنای بنچك.

٢٦١٣. مەمانکەنە دەف پای داییرەکەوە.

٢٦١٤. مەمشۆرە بە پیس ئاوێ، پیاو چاکی دواییشم ناوێ.

٢٦١٥. مەن پڕ بوو، شەرمی لە کەس نییە.

٢٦١٦. مەنێ و ماست لە وەخت خۆیا ئەخورێ.

٢٦١٧. مەنازە بە بوون مەگری بۆ نەبوون، تا سەر نین بوون و نەبوون.

٢٦١٨. مەنازە وە دریا و دەروازە، دایك بوینە و دوختەر بخوازە.

٢٦١٩. مەنجەڵ وە شوێن سەر قەپان خۆیا ئەگەڕێ.

٢٦٢٠. مەنیشە وەلای دزەوە، دز ئەوپێچێ وە تڕ و تیزەوە، بنیشە وەلای خاسەوە، خاس ئەوپێچێنێ وە لیباسەوە.

٢٦٢١. مەی بخۆ، مەیخانە بسووتێنە، وەلێ مەردم ئازاری مەکە.

٢٦٢٢. مەیموون تەبیعەت.

٢٦٢٣. مەیموون لە خۆیا نەبوو، هاوڵەیشی دەگرت.

٢٦٢٤. مەیموون لەسەر قنگ هەڵئەپەڕێنن.

٢٦٢٥. مەیموون نازانێ لەکام دار بڕواتە بان.

٢٦٢٦. مردگ بە ئاو پاك ئەبێتەوە.

٢٦٢٧. مردن باشترە لە تانەی عەبدان.

٢٦٢٨. مردوو وە شەوق و رەحم، قەورکەنی نییە.

٢٦٢٩. مردوو لە ئێش ناترسێ.

٢٦٣٠. مردوو وە خێر خۆی ناچێتە قەور.

٢٦٣١. مردوو وەسیەت خۆی پی ئەوەڕیێ.

٢٦٣٢. مرقەی لێوە نایێت.

٢٦٣٣. مریشك رەش هێلکەی سپی ئەکا.

٢٦٣٤. مزگەوت تا ناوی وێساوێ دەری حەرامە.

٢٦٣٥. مزگەوت گەر بڕمێ مێعراوەکەی ئەمێنێت.

٢٦٣٦. مزگەوتێك بڕووخێنی لەوە باشترە دڵ بنیامێك بشکێنی.

٢٦٣٧. مسەمسی ناوێ، مسەفای پاك.

٢٦٣٨. مسی یا مسافری، موسوڵمانی یا کافری، وە سەر مسم وە پا مسافر وە دڵ موسڵمان وە نەفس کافرم.

٢٦٣٩. مشت نموونەی خەروارە.

٢٦٤٠. مشت وە خەرمان دیارە.

٢٦٤١. مشتەی ناو هەوانەکە جەرگمی بڕیوە.

٢٦٤٢. مشتی نەیگازی ماچی کەی باشە.

٢٦٤٣. مشك چاوی لە پشیلەوە نەوێت تیل‌تیلانیە.

٢٦٤٤. مشك لە خەوا مردووە.

٢٦٤٥. مشك لە دیوار خۆی ئەترسێ.

٢٦٤٦. مشك لەماڵیان بە چێوشەق ئەڕوات.

٢٦٤٧. مل لە تێغ ئەساوێ.

٢٦٤٨. ملّ و مۆیی ئەکرد.

٢٦٤٩. من ئاغا و تۆ ئاغا کێ جێمان بۆ داخا.

٢٦٥٠. من ئەیژم نێرە ئەو ئەیژێ بیدۆشە.

٢٦٥١. من ئەیقوژێنمەوە ئەوان دای ئەگیرسێنن.

٢٦٥٢. من ئێژم دەهۆڵەکەم درپاوە ئەو ئەیژێ بیکوتە.

٢٦٥٣. من بۆ تۆ مردوو، تۆ من وە تڕ سەو حەساو نەکردوو.

٢٦٥٤. من بۆ تۆمە، تۆ بۆ کێتە.

٢٦٥٥. من بەرزت ئەکەمەوە خوا بتواتەوە.

٢٦٥٦. من خۆشم لە برنجە، بۆیە کەیفم ئەونە قنجە.

٢٦٥٧. من دایەگ گام لە بێوڵەتی ئەگەڕێ.

٢٦٥٨. من رازی و تۆ رازی، دارێك بە قنی قازی.

٢٦٥٩. من شوێن کەروێشك لە وشکیا هەڵئەگرم، تۆ لە بەفرا لێم گوم ئەکەی.

٢٦٦٠. من کەڵەشێر تۆ واڕۆك، هەر وەخت هاتم خۆت پانەوکە.

٢٦٦١. من لە کوێ بیرەوار لە کوێ، رێگەی چفت و چۆڵ ناهەموار لە کوێ.

٢٦٦٢. من ناسر و تۆ داود ئەم مامڵە هەر ناوێت.

٢٦٦٣. منالّ تا نەدرێتە عەرزا، نازانێ برۆا.

٢٦٦٤. منالّ چ لیبەیت چ بیترسێنی حوکمی وەسە یەك.

٢٦٦٥. منالّ گەوهەری ماڵە.

٢٦٦٦. منالّ نیت وەبان ماڵەوە، منالّ هاویتە بان ماڵەوە.

٢٦٦٧. منالّی بوچکیش خەو گەورە دەبینێ.

٢٦٦٨. موو لە موو ئەچێ و گلۆڵە لە پۆ.

٢٦٦٩. مفتەخۆر خۆش سەلیقەس.

٢٦٧٠. موو لە سەر زوانما سەوز بوو.

٢٦٧١. مووری کوندار ناکەوێتە عەرز.

٢٦٧٢. میتەی نەماوە گزە ئەکا.

٢٦٧٣. مێخ وە بەردا بچێ، قسە وە گوێی کەردا ناچێ.

٢٦٧٤. مێخی کوتا بان پاتۆڵ خۆیا.

٢٦٧٥. میراتی کەر بۆ کەمتیارە.

٢٦٧٦. میراتی هاوسا وە هاوسا رەواس.

٢٦٧٧. میرووی ماڵ هاوسا مەگەر بە شەوا بکرێتە مل.

٢٦٧٨. مێشکی بەتاڵ، تەونی ئەهریمەنە.

٢٦٧٩. مێشم لە ئاو نەکردە.

٢٦٨٠. میوان بەلەوسا رۆزییەکەی خوا بۆی ئەنێرێ.

٢٦٨١. مییوان خۆشی لە مێوان نەئەهات، ساحێوماڵ لە هەردووکیان.

٢٦٨٢. میوان ناوەخت وەسە ترِ ناخافڵ.

٢٦٨٣. مێوان ناوەخت هەمیشە بێ بەخت.

٢٦٨٤. میوان نایەوێ سفرەت رەنگین وێت، نانت جۆیین بێت خولکت گەنمین بێت.

٢٦٨٥. میوان وە رووی خانەخوێ نان ئەخوا.

٢٦٨٦. میوانی درەنگ وەخت گلەیی لە پای خۆیەتی.

٢٦٨٧. نۆپاچکە نۆ نەفەری هەرەکە.

٢٦٨٨. نۆ مەن خوێی پێ هەڵئەگرن.

٢٦٨٩. نۆبەرەی گێلاًست هاوردە.

٢٦٩٠. نۆکەری بێ جیرە، تاجی سەر ئاغاس.

٢٦٩١. ناتوانی بزێیت بۆ کەڵت گرت.

٢٦٩٢. ناتوانی بچیتە بان کێف لەناو چەما مەوێسە.

٢٦٩٣. ناز باوك و دایك وەسە تاجی سەر، ئەمما ناز براو و براژن وەسە حەق نۆکەر.

٢٦٩٤. ناز لە ئەنازە.

٢٦٩٥. ناز لە ئەنازە دەرچوو عەیبە.

٢٦٩٦. نازانێ رشتە بۆ خۆی بورێتەو، پرپۆڵە بۆ مەردم ئەکا.

٢٦٩٧. نازانێ هەڵپەڕێ دەڵێ حەوشەکەی لارە.

٢٦٩٨. نازانم و ناتوانم راحەتی گیانم.

٢٦٩٩. نازت بەقەد جیهازت.

٢٧٠٠. نازمان هەیە زۆرمان نییە.

٢٧٠١. ناشیسوار سوار ئەوێ، جڵەوی نەگری هار ئەوێ.

٢٧٠٢. ناشی هات نەقشینی کات، ساکاریشی نەکرد.

٢٧٠٣. ناچیزە وە دەنکێ جۆ سەڕی تێ.

٢٧٠٤. ناعیلاجی حەرام، حەڵاڵ ئەکات.

٢٧٠٥. نافیرێنێ بە گیای بەهارا.

٢٧٠٦. نامەوێ بیکێشم باری موحتاجی، گۆشتی کەروێشك و تسی تانجی.

٢٧٠٧. نان ئەونە فەقیرە، گ کەسێك ئەیخوات.

٢٧٠٨. نان بۆ نانەوا، گۆشت بۆ قەساو.

٢٧٠٩. نان بدە بە سەگ، لە بەر خاوەنی.

٢٧١٠. نان بە ناوچاوە.

٢٧١١. نان بە وە سەگ، مەیدە بە سپڵە.

٢٧١٢. نان جۆ تا نیمەڕۆ.

٢٧١٣. نان حەڵاڵ وە سەختی وەدەس دێت، وە سەختی لە دەس ئەچێ.

٢٧١٤. نان خۆت پەیا بکە و منەت پاوشا مەکێشە.

٢٧١٥. نان خۆت لەبەر شاڵ خۆت.

٢٧١٦. نان خۆمانە و کووزەڵەی کانی، مێوانی هەی مێوانی.

٢٧١٧. نان خواردن بە ئیشتهای خەڵك نابێ.

٢٧١٨. نان گاڵ تا بان ماڵ.

٢٧١٩. نان گەنم بەهارە، سك پۆلاییینی گەرەکە.

٢٧٢٠. نان کوت بوێ، نانووسێتە یەکەوە.

٢٧٢١. نان لە ماڵیا نییە، پیاز ئەکرێ.

٢٧٢٢. نانم وە گوێچکە نەجاویە.

٢٧٢٣. نان نانەوا هەڵوایە، پاچکەگای ژن بخۆ شەفایە.

٢٧٢٤. نان نەخۆرە، گوو نەکەرە.

٢٧٢٥. نان، نانی جۆیین، خوڵك گەنمین.

٢٧٢٦. نانێ بخۆ و نانێ بە لە ساقەی سەری.

٢٧٢٧. نانێ وا با هاوردی، با بڵاوی ئەکاتەوە.

٢٧٢٨. نانە رەق ماڵ خۆتان لە چلاوخۆرشت ماڵ پاوشا باشترە.

٢٧٢٩. نانت وە سەر ساجەوە سووتاوە داوای ژن ئەکەیت.

٢٧٣٠. نانی خۆی لەسەر سفرەی خەڵکا ئەخوا.

٢٧٣١. نانی کەوتەسە رۆن.

٢٧٣٢. نانێ لەت و دووان کوت، داری میوان بە بنی دووت، بۆ نانێ کردو بۆ شووت، دەمی میوان

بە کونە بابێك، ئاردەکە ناشیرینە و نانی لـێ نایەت.

٢٧٣٣. نانی نییە لە ماڵیا، پیاز ئەخوا ئیشتیای باز بوێت.

٢٧٣٤. نانێکی خواردوە بەو ڕۆنەوە هەر بۆ ئەکاتە ئەو شوێنەوە.

٢٧٣٥. ناوزەوقی لە سەر کەچەڵی خراپترە.

٢٧٣٦. ناو گەورە باشترە لە بان ماڵ گەورە.

٢٧٣٧. ناو لە ناو عەشق ئەگرێ.

٢٧٣٨. ناوبانگ و شۆرەت بە جێ و مەکانە، بەردیش لە جێی خۆی قورس و گرانە.

٢٧٣٩. ناوجێکەر دڵی فەرێحە.

٢٧٤٠. ناوسکم قۆڕەقۆڕ ئەکا داوای هێلکەوڕۆن دەکا.

٢٧٤١. ناوسکی ئەیشێ قەیسی ئەخوا.

٢٧٤٢. ناوکمان گرتەو.

٢٧٤٣. ناوی چاکە تا سەر ئەمێنێ.

٢٧٤٤. ناوێ گەورە و شارێ وێران.

٢٧٤٥. ناوی لە کوولەکە باخانا نەماوە.

٢٧٤٦. ناوی هەیە، ناوکی نییە.

٢٧٤٧. نە ئاسمان هەڵمئەلووشێ، نە عەرز قووتم ئەدا.

٢٧٤٨. نە ئەخۆم گڵەسن، نەرم ئەبن ئەورازن.

٢٧٤٩. نە ئەسپی لاغر ڕۆژ شەڕ وەکار تێت، نە گای پەرواری.

٢٧٥٠. نە ئەوەندە وشك بە بشکێت و نە ئەوەندە تەڕ بە بگوشریت.

٢٧٥١. نە بۆ کوێر هەڵپەڕە نە بۆ کەڕ گۆرانی بێژە.

٢٧٥٢. نە باوەڕ کە بە سەرمای زستان نە بە دڵخۆشی ئاغەوات.

٢٧٥٣. نە بە پێکەنینی زاڵم باوەڕ بکە نە بە خۆشی زستان.

٢٧٥٤. نە بە سوێندن ژن بڕوا بکە نە بە پێکەنین حاکم.

٢٧٥٥. نە تەونم هەس نە تەشی نە سەعاتێ کەوتمە خۆشی.

٢٧٥٦. نە حیز پیر ئەوێت نە شێت ژیر ئەوێت.

٢٧٥٧. نە خۆت خواردت نە قۆناخت سەگ یەل خواردیان بووە داخت.

٢٧٥٨. نە خاس خراو ئەوێت و نە خراو خاس ئەوێت.

٢٧٥٩. نە خواردی و نە دڕی، هاوساماڵ بۆشی تڕی.

٢٧٦٠. نە دەمم بوو ها بکەم، نە پام بوو ڕا بکەم، ئەی قوڕی کوێ وە سەرا کەم.

٢٧٦١. نە ژن لە زەماوەنا هەڵبژێرە نە کەر لە بەهارا.

٢٧٦٢. نە شای دوو کەسم نە گەدای بێ کەسم.

٢٧٦٣. نە چەك زەدەم نە چوونە، عەرووس ئامەد بە خوونە.

٢٧٦٤. نە گوڵ گەنمی دییە، نە چەقەنە ئاسیاو.

٢٧٦٥. نە قەرز گەلە، نە قەرز خەلە.

٢٧٦٦. نە کارمان هەس نە بار، ڕەقمان کردە وەك دار.

٢٧٦٧. نە لە خێرا هەس، نە لە شەڕا.

٢٧٦٨. نە لە دایکم نە لە باوکم، گۆزەڵە گونێ بووە وە برام.

٢٧٦٩. نە لە شندەڕێ نە لە شەمۆڵێ، ئارد پەیدا نەبوو بەشی پرپۆڵێ.

٢٧٧٠. نە مشتم هەیە نە پشت.

٢٧٧١. نە وە بەرخی تێر شیرمان خوارد نە وە کاوڕی تێر گیامان خوارد.

٢٧٧٢. نە وە گردی شووتی و نە بە درێژی کالیار.

٢٧٧٣. نەچارِ ئەرێ دڵی خۆش وێت لە بان بەرد دار ئەتاشێ.

٢٧٧٤. نەجیب خەتا ناکا، نانەجیب وەفا ناکا.

٢٧٧٥. نەخۆش میوانی خوایە، زۆری لێ مەکە بۆ خواردن.

٢٧٧٦. نەخۆشی جوانان وەسە دلۆپەی بانان.

٢٧٧٧. نەخۆشی سەرمایەی دوکتورە.

٢٧٧٨. نەخت تیرێتە بەخت.

٢٧٧٩. نەخت لە هەزار بەخت باشترە.

٢٧٨٠. نەدار هەموو کات کراسەکەی لە پشتەوە ئەدرێت.

٢٧٨١. نەدیوبدی کورێکیان بوو لە جیاتی ناوك، کێریان بری.

٢٧٨٢. نەزم تەپاڵە باشترە لە هەڵیت و پەڵیت تەلا.

٢٧٨٣. نەچووە، بچێ.

٢٧٨٤. نەگبەتی بێ وە شانا، گوی شل تێ وە رانا.

٢٧٨٥. نەقلێ کوفر، کوفر نابێت.

٢٧٨٦. نەکردەکاران مەبەن بۆ کاران، دەیانبەن پێیان مەسپێرن کاران.

٢٧٨٧. نەمانخواردووە نانی گەنم، دیمانە لە دەس مەردم.

٢٧٨٨. نەمرێ و نەچێ لە خۆی ئەچێ.

٢٧٨٩. نەورۆزە، نەو بازە، چتێ بخەنە ئەم کاسە هەر بۆ خوا خاسە.

٢٧٩٠. نەوس کافرە، ئەبێ موسوڵمانی کەی.

٢٧٩١. نەوس کافر موسوڵمان ئەکا.

٢٧٩٢. نەهامەت خۆی خاسە، قۆرتەکەی خراوە.

٢٧٩٣. نەهامەتی بەر وە نێرەکەر ئەخا.

٢٧٩٤. نە هێندە تاڵ بە تفت کەن، نە هێندە شیرین بە قووتت بەن.

٢٧٩٥. نرخێکە، شا عەباس[1] بڕیەسەوە.

٢٧٩٦. نزیك وە لە سەوسفەت، دوور بە لە پشیلەسفەت.

٢٧٩٧. نشوومەی تاریکەشەو، سەر لە ئێوارە دیارە.

٢٧٩٨. نوقمبوو لە وەخت نوقمبوونا، دڵ وە دڕك و داڵ خۆش ئەکا.

٢٧٩٩. نووشتەی مەلا هەر فەن و فێڵە، داخۆم چارەنووس لە شوێن کێ وێڵە.

٢٨٠٠. نوێژ لەناو چەما حەرامە.

٢٨٠١. نوێژخوێنی نوورینی، کارکەری شیرینی.

٢٨٠٢. نییە لە ماڵیا یاهووی دەورێشیان، قولدرێژ هاتە چۆپی کێشان.

٢٨٠٣. نێرەکەر وە نێرەکەر داین، مایەی جانبازییە.

٢٨٠٤. نیسکەشۆر کردن.

٢٨٠٥. نیشتماندۆستی مایەی ئیمانە.

٢٨٠٦. و سەو بیت بە برا چکۆلە نەویت.

٢٨٠٧. وا داتە لە لانی بێ عاری، هەم لە ناڵ ئەیت هەم لە بزماری

٢٨٠٨. وا لە بیگانە بەرز ئەڕوانی لە ئاست خۆمانە هیچ کاتێ وا نیت.

٢٨٠٩. وات لـێ ئەدەم عەرەو لە گامێشی نەداوێ.

٢٨١٠. واعیز ئەوەی ئەیلێت نایکا.

٢٨١١. وای ئەناسێ، بانەییش کەر خۆی وا ناناسێ.

٢٨١٢. وە بان گووی مەردمەوە ئیسکی مەڕۆ.

٢٨١٣. وە تەپ و تۆز بەر خۆر ناگیرێ.

---

١ـ شاعەباس ناودارترین پاوشای سەفەوییە کە زۆر سام و سەڵەواتی هەبووە و هەر قسەیەکی بکردبایێ بێ ئەملاوئەولا جێبەجێ دەبوو، واتە لە سەرەوەی ئەمر و قسەی پاوشا هیچ قسەیەك بایەخ و نرخی نەبوو.

٢٨١٤. وە ترس و لەرز تێتە دونیا، وە ترس و لەرز ئەڕوێتە ئەو دنیا.

٢٨١٥. وە توون و تەوەن.

٢٨١٦. وە پا رۆیت وەسەر نەیتەوە.

٢٨١٧. وە پای مەردم شەق مەوەشێنە.

٢٨١٨. وە جوانی خۆی شێخ ئەواتە مەیخانە.

٢٨١٩. وە جومعە فێرم وە شەممە کوێرم.

٢٨٢٠. وە خۆشەویستی ژن باوەڕ مەکە.

٢٨٢١. وە خاسە خاسە، گووی کردە کاسە.

٢٨٢٢. وە خاستم زانی تومەس خاس نەویت، وەك حەکاك دانا دوڕشناس نەویت.

٢٨٢٣. وە خەم مەنیشە، وە شادی بنیشە خوا یاوەرت بێ.

٢٨٢٤. وە ۆسی دۆسی، کای کردە پۆسی.

٢٨٢٥. وە دەسێ دوو شووتی هەڵناگیرییێت.

٢٨٢٦. وە دەنگ کچە و وە رەنگ ورچە.

٢٨٢٧. وە ژن مەیژە جوانی لە خۆشیا شێت ئەوێت.

٢٨٢٨. وە رۆن خۆی سەر خۆی ئەهەناوێ.

٢٨٢٩. وە رازیانە رازیانە سك خۆش ناوێتەوە.

٢٨٣٠. وە ریش مەردانەت قەسەم.

٢٨٣١. وە زاوا ناوێت ئەیژێ بێ بنە.

٢٨٣٢. وە زەڕ بیسێنی و نەوەت بیسووتێنی.

٢٨٣٣. وە چلەی زستان بە لە چەشمەی سەرد، مەچۆ لە بان پرد ناکەس و نامەرد.

٢٨٣٤. وە گا کەروێشك دەگرێ.

٢٨٣٥. وە گاوەسەنگ حەرامە وە ماڵە حەڵاڵە.

٢٨٣٦. وە گیان سەرهەنگ وە ناوپای خانم، تۆپ و تەیارەتان وە گونم نازانم.

٢٨٣٧. وە کار نییە وە چارەس.

٢٨٣٨. وە کەر ناوێری وە کۆپان ڕەپەڕەپ ئەکا.

٢٨٣٩. وە کلك شێر کایە مەکە.

٢٨٤٠. وە لێفەی سوالکەری گەرمت ناوێتەوە.

٢٨٤١. وە مشت مەدە لە دەرگای خەڵك با وە شەق نەدەن لە دەرگات.

٢٨٤٢. وە من بوێت کەر و بار، وە ژن نەوێت خاروبار.

٢٨٤٣. وە هەرچی باس شەن ئەکات.

٢٨٤٤. وە بۆنەی گوڵێ هەزار گوڵ ئاو ئەخواتەوە.

٢٨٤٥. وەخۆم ئەکەنی خوا درووسمی کردە، وە لیباسم ئەکەنی خەیات درووسی کردە.

٢٨٤٦. وەخت لە گەوهەر خاسترە.

٢٨٤٧. وەختێ بکە بەردەفڕان، ئێوارە وێساوی لە تەك فاتەی سوورەوان.

٢٨٤٨. وەختێ دریای تازە ئەسەنی، ئەشێ جیڕەیشی بێت.

٢٨٤٩. وەختێ ڕەفیق قازی ویت، ئەشێ فاتێحای قانوون بخوێنی.

٢٨٥٠. وەختی خوا شەیتانی لە جەهەنەم ئەسیر کرد، ژنی خەڵق کرد تا جێگەی شەیتان بگرێتەوە.

٢٨٥١. وەسە ئاور ژێر کا.

٢٨٥٢. وەسە بەرخ دایك مردوو.

٢٨٥٣. وەسە تانجی بان تایە ئەلەرزێ.

٢٨٥٤. وەسە تانجییەکەی قوباد لە راوا گووی تێ.

٢٨٥٥. وەسە پشی حەفت گیانی هەس.

٢٨٥٦. وەسە پیازەکەی عەوالان[1]، خواردنی هەیە، بردنی نییە.

٢٨٥٧. وەسە خواردییە گۆشت گا، شەماڵ نە پای دەری هەس نە نیشتنی ماڵ.

٢٨٥٨. وەسە درگای ناوین چ بیکەیتەوە چ بیبەسی جیاوازی نییە.

٢٨٥٩. وەسە سەعات مووسایی.

٢٨٦٠. وەسە سەو پا سووتیاو.

٢٨٦١. وەسە گای بێ گاوان.

٢٨٦٢. وەسە گوریس ناو هەوانە، ئەوەنە پێچە.

٢٨٦٣. وەسە گووی سەر رێ.

٢٨٦٤. وەسە فیل چەرمی ناوڕیێت.

٢٨٦٥. وەسە فیل لە لەشی ناوڕیێ.

٢٨٦٦. وەسە قاپ قومارخانە.

٢٨٦٧. وەسە کاسەی چەور، هیچ لە خۆی ناگرێ.

٢٨٦٨. وەسە کەر لای جووتیار دایمە قوتە ئەکا.

٢٨٦٩. وەسە کەر میوان، ناچێتە ماڵەوە.

٢٨٧٠. وەسە کورد دۆنەدیو.

٢٨٧١. وەسە مامر تا نیمەشەو گەوەتاو ئەگرێ، لەلایەکی دیکەوە تا بەیانی لە برسییەتیا خەوی لێ ناکەوێ.

٢٨٧٢. وەسە ورچ تا چت بۆ نەکا نایخوا.

٢٨٧٣. وە سەر ئاو حەمامەوە تەعارف ئەکا.

---

١ـ عەوالان، ناوچەیەکە سەربە شاری سەقز، گوایە جۆرە پیوازێکی هەبووە کە بە تەنیا دەتوانی لەو شوێنەدا بیخۆی، بەڵام نەدەکرا بیبەی بۆ شوێنێکی دیکە.

٢٨٧٤. وە سەر بیچك و دڵ گەورە، ئەتوانی هەچی شتە بێرێتە دەس.

٢٨٧٥. وەختێ دار ئەنێم تەنیام، وەختێ میوە جەم ئەکەمەوە پڕ دەورمە.

٢٨٧٦. وەقەو ئاشەوانەکەی قەرەولی[1] تێناگا.

٢٨٧٧. وەك ترێشتە هەر بۆ لای خۆی ئەیتاشێ.

٢٨٧٨. وەك تێسکەی تفەنگ ئەڕوات.

٢٨٧٩. وەك سەماوەر حەفت جۆش ئەکولێ.

٢٨٨٠. وەك سرینچکی سووری ناو رەشەوبوو وایە.

٢٨٨١. وەك چنار راست بە.

٢٨٨٢. وەك گایێ گلێنەی خواردوێت، هەر پێچ ئەدا لە خۆی.

٢٨٨٣. وەك گڕی گڕاڵك زوو ئەقوژێتەوە.

٢٨٨٤. وەك گون هەڵاج ئەلەرزێ.

٢٨٨٥. وەك گوێی کەر جووتین.

٢٨٨٦. وەك کەر ناو جۆلە، لە هەر دوو لا دەخوا.

٢٨٨٧. وەك کەر ناو قوڕاو گیر ئەکا.

٢٨٨٨. وە کەروێشك ئەیژێ هەڵی وە تانجی ئەیژێ بیگرە.

٢٨٨٩. وەك کەڵەشێر ناوەخت وایە.

٢٨٩٠. وەك کەڵەشێر و مامر خۆی داسە خۆر، ئەیژی سپێ تیدا.

٢٨٩١. وەك مۆم نەرم وە وەك دەرزی رووت.

٢٨٩٢. وەك مار ها لە پێوارا.

٢٨٩٣. وەك ماری بێ ئیجازە وایە.

---

١ـ ناوی گوندێکە لە ناوچەی سەقز.

٢٨٩٤. وەك مایەی مووسایی وایە.

٢٨٩٥. وەك مشار بە نە وەك ترێشتە.

٢٨٩٦. وەك مووی لووت وایە.

٢٨٩٧. وەك وشتر کەوتە لۆقە.

٢٨٩٨. وەك وشتر ناو پەمۆ چاو ئەقووچێنێ.

٢٨٩٩. وەك هەسێڵدڕە واسە هەر لە ژێرەوە کار ئەکا.

٢٩٠٠. وەکوو پێسەی سیراجی لێ هاتووە.

٢٩٠١. وەکوو کەروێشك کلۆڵێ.

٢٩٠٢. وەلای کلکیا رۆی.

٢٩٠٣. وتم دەمێ بی بۆ قاوڵتی، نەك بی لێرا دایکوتی.

٢٩٠٤. وەوی بێ خەسوو وەك بەچکە مشك سەر خەزێنەس.

٢٩٠٥. وەوی تازە، رەبییس ماڵە.

٢٩٠٦. وەوی هات خەسوو هەڵات.

٢٩٠٧. وەوییێکم هاوردە بێ بار و بنە، کوتەکی هەڵگرتە ئەیژێ ماڵ منە.

٢٩٠٨. وتی گا زەرد تۆ بخەفە منیش ئەخەم، بزانم قەرزار کامان ئەوات.

٢٩٠٩. وتی کەم بۆ هاتی، وتی بۆ زۆر.

٢٩١٠. وەی لە وەی، شەڕ لە شەیتان.

٢٩١١. وەی لە وەی شەرمی نییە.

٢٩١٢. وتیان بە گاور ژنەکەت زۆر ئەگەڕێ، وتی قەینا شەوی لەماڵ خۆما بووە.

٢٩١٣. وتیان بە گوری نۆرە رانتە، وتی قەینا پام کوتیا لەبەر پاڕاسی ئاوایی ئەچم.

٢٩١٤. وتیان بە نەخۆش نەخۆشیت چۆنە؟ وتی: مەمدوێنن، وتیان: گۆشت ئەخۆی؟ وتی: بۆم بێنن.

٢٩١٥. وتیان پیرەژن هەڵوا خۆشە یا شووکردن، وتی: دیان هەڵوا خواردنم نییە.

٢٩١٦. وتیان رێوی کێ شایەدتە، وتی کلکم.

٢٩١٧. وتیان: عەن، بێژە من، وتیان: گەماڵ پەڕە بان ماڵ، وتیان: جەسد پەڕە وەسەت.

٢٩١٨. وتیان وە رێوی کوێنە خۆشە، وتی: ناو باخ، وتیان ئەگەر باخ نەوێ، وتی بەرانبەری باخ.

٢٩١٩. وتیان وە گوری نۆرە رانتە، وتی بێژێ راس وێ.

٢٩٢٠. وتیان وە قرژانگ بۆ چی دووسەری؟ وتی: هیچ لە جوان ئیمرۆ مەنع نییە.

٢٩٢١. وتیان وە مەڕ ساحێوت بمرێ، وتی شوانیشم بمرێ بێساحێو نابم.

٢٩٢٢. وەیتە ئاور ژێر کا.

٢٩٢٣. وەیتە بزن وە رێی راسا ناڕویت.

٢٩٢٤. وەیتە تیلەکۆیی[1]: سەر زوان خۆش و بن زوان تاڵ.

٢٩٢٥. وەیتە پشی پشتت نادا لە زەوی.

٢٩٢٦. وەیتە پیرەژن دۆ رژیاو.

٢٩٢٧. وەیتە دەڵە رێوی ژان کردوو.

٢٩٢٨. وەیتە دەڵەشێر، سەرت هالە لایێ، قنت ها لە لایێ تر.

٢٩٢٩. وەیتە ساج ئاوایی.

٢٩٣٠. وەیتە گووی بان کلۆ.

٢٩٣١. وەیتە کەروێشك سوور، هەرخۆت دائەگری.

٢٩٣٢. وەیتە کەڵەشێر، لە ناوەختا ئەخوێنی.

٢٩٣٣. وەیتە کوتەك ناو قوڕاو.

٢٩٣٤. وەیتە ماسی، نێر و مێت دیار نییە.

---

١ـ تیلەکۆ، ناوچەیەکە لە دەوری سەقز.

٢٩٣٥. وردەو سەر و بەچکی، ئەیژی گەوج گردیە و شێت کوتایە.

٢٩٣٦. ورچ لە کون خۆیا قسە ناکا.

٢٩٣٧. ورچی نەکوژیاو پێسی مەفرۆشە.

٢٩٣٨. وشتر چ بە شەو بنوێ چ بە رۆژ، هەر خەو بە لۆکەوە ئەبینێ.

٢٩٣٩. وشتر چەرمووە لە بەر درگای هەموو کەسێکا ئەخەفێ.

٢٩٤٠. وشتر لە خەویا ئەوینێ، پەنبەی دانە دانە.

٢٩٤١. وشتر لە خەیاڵێ، وشتروان لە خەیاڵێ.

٢٩٤٢. وشتر وە لۆقە، قەومیمان کۆکە.

٢٩٤٣. وشترم نەدییە وە دەلاقەوە.

٢٩٤٤. وڵامی نەحە، تەحەیە.

٢٩٤٥. وەیتە گلۆڵە موو، دەولەمەنی باوکت داتیە شوو.

٢٩٤٦. ویژدانی چاك دەنگی خودایە.

٢٩٤٧. وێنجە کەرەمتووی گەرەکە، کەرەمتویش تیژکردنی هەرەکە.

٢٩٤٨. هۆڕ کەس لێی نە ئەپرسی، ئەیوت چل مەن ئەگرم.

٢٩٤٩. هۆشە هۆشە، دار و دیوار گشتی گۆشە.

٢٩٥٠. هۆڵیکەر کولکن و منالی چلمن لە ئاخرەوە هەڵئەدات.

٢٩٥١. هۆهۆ حەساو نییە، کۆکۆ حەساوە.

٢٩٥٢. هات برۆی خاس کا چاویشی دەر هاورد.

٢٩٥٣. هاتنە ماڵ بە لیباسە، رۆیشتن بە عەقڵە.

٢٩٥٤. هاتنەکەی بووە هات هاتەکەی رۆمەوە.

٢٩٥٥. هاڕەی مەشکە تێ، گەوج ئەیژێ ئەوە گا بۆ ئەقۆڕێنێ.

٢٩٥٦. هاڵاو خۆشە تا پلاو.

٢٩٥٧. هاوسێ لە هاوسێ ئەگرێ سەراسێ.

٢٩٥٨. هاوسا ئەشێ کەل هاوسا بگرێ.

٢٩٥٩. هاوساماڵ نان ئەکا بن جیجکانم ژان ئەکا.

٢٩٦٠. هاوسای خراو لە گۆڕەوشاری قەور خراوترە.

٢٩٦١. هاوسای چاك لە برای دوور چاکترە.

٢٩٦٢. هەتا بموێ پلاو و گۆشت، قەومین تا پشتەوپشت.

٢٩٦٣. هەتا تۆ حاڵی ئەکەم، بۆشکەیێ نەوت خاڵی ئەکەم.

٢٩٦٤. هەتا درێژ ئەچەمێتەوە، کوڵ ناوماڵ ئەچنێتەوە.

٢٩٦٥. هەتا دووکەڵ نەکەیتە چاو مەردم، کەس دووکەڵ ناکاتە چاوت.

٢٩٦٦. هەتا شەو نەوێت، مانگ قەوری نییە.

٢٩٦٧. هەتا کارێ ئەکا قیر سپی ئەبێ.

٢٩٦٨. هەتا لەم بەرەوژووربیە ئەچینە سەر، پلیکانەیەك درووست ئەکەین.

٢٩٦٩. هەتا لووتت نەدا لە کوچك، قەدر عافییەت نازانی.

٢٩٧٠. هەتا مابوو کراس نەبوو لە بەریا کە مرد ئاڵیان ئەکردە سەریا.

٢٩٧١. هەتا نەترێ چوارمشقی دانانیشێ.

٢٩٧٢. هەتا نەموێ پلاو و گۆشت، تۆ وە لەقە من وە مشت.

٢٩٧٣. هەتا نەوینی تەم لەسەر کێوان، باوەڕت نییە وە رەنجەڕۆیان.

٢٩٧٤. هەتە درێغ مەکە، نیتە قەرز مەکە.

٢٩٧٥. هەتەر مەتەر لە بۆ سەر.

٢٩٧٦. هەتیم چاوی وە دەنکێ جۆ کەوێت، سەڕی تێت.

٢٩٧٧. هەتیمچە سواری کەری کەی، لفکەی لار ئەوێ، جڵەوی نەگری هار ئەوێ.

٢٩٧٨. هەتیو ئەگیریا ئەیگوت بەشم کەمە، ئەوەیشی بوو سەگ خواردی.

٢٩٧٩. هەژاری سەر راست، سەرێکی دەوڵەمەندە.

٢٩٨٠. هەژاری، دایك هەموو فیتنەییێکە.

٢٩٨١. هەر ئەکەوێتە دوای ئەم و ئەو، ئەیژی تڕ دوای لۆتییە.

٢٩٨٢. هەر ئەیکوژێ و ئەچێت بۆ خەییەر.[1]

٢٩٨٣. هەر بۆر بێ و زۆر بێ.

٢٩٨٤. هەر بەهەشتێ مار خۆی هەس.

٢٩٨٥. هەر بنیامێ ئەبێ وە ئەنازەی عەقڵی خۆی قسە بکا.

٢٩٨٦. هەر تکیان سەر و بن کڵاشێکن.

٢٩٨٧. هەر پەنجەیەك خوێنی خۆی لێ دێ.

٢٩٨٨. هەر پیر و هەر گیر.

٢٩٨٩. هەر خاسێك جواوێك، هەر خراوییێك جواوێکی تری هەس.

٢٩٩٠. هەر خوایان یەکێکە.

٢٩٩١. هەر دۆڵێکیان بە بایەك سپاردووە.

٢٩٩٢. هەر دەردێ دەواییێکی هەس.

٢٩٩٣. هەر دوو جاشی ماکەرێکن.

٢٩٩٤. هەر دیانێکی وە سەد ساڵ دەرهاتە.

٢٩٩٥. هەر ژنێ دوو سك دووقلوو بکات، بە ئاور جەحانم ناسووتێ.

٢٩٩٦. هەر رۆژێ کەسێ دیانی بۆ تیژ ئەکاتەوە.

---

١ـ گوندێکە لە تەنیشت شاری سەقز هەڵکەوتووە.

٢٩٩٧. هەر راییێك تەونێکمان بۆ ئەنێتەوە.

٢٩٩٨. هەر رێگەیەك کە تورك پێدا بڕوا گیای لێ سەوز ناوێت.

٢٩٩٩. هەر رێگەییێکیان بە رێبوارێك سپاردووە.

٣٠٠٠. هەر زاڵمێك زەواڵێکی هەیە.

٣٠٠١. هەر سەرێك سرێکی هەیە.

٣٠٠٢. هەر سمێڵ سووری بایز ئاغا نییە.

٣٠٠٣. هەر شتێ تا زرق و برقی زۆرتر وێت، زیاتر دەوری ئەگرن.

٣٠٠٤. هەر شتێ لە جێگای خۆی خۆشە.

٣٠٠٥. هەر شەپێ، شاپانێ تێرێ.

٣٠٠٦. هەموو شتێك لە باریکیدا ئەوڕیێت، زوڵم لە قەوی بووندا.

٣٠٠٧. هەر چاوێکی چل جنۆکەی هاتیا.

٣٠٠٨. هەر چتێ لە وەختی خۆیا دێتە بەرهەم.

٣٠٠٩. هەر چی قن زلە وە خەفتنەوە لە دایك بووە.

٣٠١٠. هەر چێکت کردە بەر بێژنگا، بیکە پشتیا.

٣٠١١. هەر گوڵێك بۆی خۆی لێ دێ.

٣٠١٢. هەر گوێزی خڕ ناوکی ساقی تیا نییە.

٣٠١٣. هەر قەومێك خراو لە هەزار دانە بێگانە خاسترە.

٣٠١٤. هەر قسەیەك لە دڵەو دەرێ لە دڵ جێگە ئەگرێ.

٣٠١٥. هەر کۆچێ مانگا بەرکۆچی بێت، وە قۆڕا ئەچێ.

٣٠١٦. هەر کە بێژێ جەژنە من برنج ناکەمە ئاو.

٣٠١٧. هەرکە چاڵ هەڵکەنێ بۆ مەخلووقی خوا، خۆی تی ئەکەفێ بە تۆفیقی خوا.

٣٠١٨. هەر کە کەر بێ ئەو کۆپانە.

٣٠١٩. هەر کە وە تەمای بارامعەلی وێ، کەری پشتە رووت باری خاڵی وێ.

٣٠٢٠. هەر کەس باوەڕ کات وە باوەڕی ژن، ماڵەکەی وێران وەك ماڵەکەی من.

٣٠٢١. هەر کەس لە خۆف خوا غافڵ وێ، هیچ شکی تێدا نییە کافرە.

٣٠٢٢. هەر کەس وە تەمای ئیزافە بەشە، حەقیە پی بێژن کام چاوت رەشە.

٣٠٢٣. هەر کەسێ تسی هەواڵی پرسی.

٣٠٢٤. هەر کەسە کەسە، قسەیەکی بەسە.

٣٠٢٥. هەر کەسە نرخی خۆی هەیە.

٣٠٢٦. هەر کێچێکی سەد مەن شیر ئەدات.

٣٠٢٧. هەر لە گوڵێك هالاوێ.

٣٠٢٨. هەر لە عەرش تا وە قورش، کەس وە دۆی خۆی ناڵێ ترش.

٣٠٢٩. هەر لەچك وەسەر باشە لە کلاو وەسەر.

٣٠٣٠. هەر کە مۆزە، پێی ئێژن ئاڵەتی.

٣٠٣١. هەر ماڵێ کتێب لە ناویا نەبێ، وەکوو لاشەیەکە گیانی تیا نەبێ.

٣٠٣٢. هەر مەردێ، بەردێ.

٣٠٣٣. هەر مەلەوان ئەخنکێ.

٣٠٣٤. هەر مەلێ، پۆل خۆی.

٣٠٣٥. هەر وەخت ژنەکەت لێت هەڵ ئەماڵێت، ماڵ وە جێی بێلا روو بکەرە پالێ.

٣٠٣٦. هەر وەختێ ئەیوینم گووم تێت.

٣٠٣٧. هەر وەك مارمولك خۆی ئەکێشێتە هەرچی کونا.

٣٠٣٨. هەر وەکوو چرای مردیە.

٣٠٣٩. هەر هێڵێ لار بێت خەتای گاسوورە.

٣٠٤٠. هەرا هەرا مەکە، وەك کەر نیمەسەڕت پێ ئەکەم.

٣٠٤١. هەڕاکەرەی کۆڵ نەکەرە.

٣٠٤٢. هەر بازی، بازی بە ریشی قازی.

٣٠٤٣. هەر تاشیم و هەر هاتەوە، فلانی هەر نەهاتەوە.

٣٠٤٤. هەڕەشەی کوردی زاورمی بردی.

٣٠٤٥. هەرەمێ تەکێنێکت بۆ لێدەم.

٣٠٤٦. هەرچەن زۆر ژیر و مەردمشناسی تا لێت نەقەومێ مەردم ناناسی.

٣٠٤٧. هەرچی ئەخۆی وە شەو تاریك، ڕەنگت زەردە و قولت باریك.

٣٠٤٨. هەرچی ئەزانی مەیژە، هەرچی ئەتوانی مەیکە.

٣٠٤٩. هەرچی با هێنای، با بردی.

٣٠٥٠. هەرچی بێت، قژ بەسەر بێت.

٣٠٥١. هەرچی ڕەشە تام و بۆن خۆشە.

٣٠٥٢. هەرچی سەنگە ماڵ پای لەنگە.

٣٠٥٣. هەرچی گولە قسەزلە.

٣٠٥٤. هەرچی قەفەس تەنگتر بێ، ئازادی خۆشترە.

٣٠٥٥. هەرچی لە بەرچاوا نییە لە بەر دڵانە.

٣٠٥٦. هەرچی لە دیانە لە گوانە.

٣٠٥٧. هەرچی لە لای خواوە هات خۆش هات.

٣٠٥٨. هەرچی لە مشکە جەواڵ ئەدرێ.

٣٠٥٩. هەرچی مشتوماڵ زاخاو ئەیەم پێت، هەر لەشت ژەنگ دێنێ لە بەو ئەسڵی پێت.

٣٠٦٠. هەرچی مێرووله کردی بە ساڵێ، وشتر لێسی دا هەر بە قەپاڵێ.

٣٠٦١. هەرچی نازانی بڕۆ بپرسە، پرسین عەیب نییە بڕۆ مەترسە.

٣٠٦٢. هەرچی وتی: مامۆسا وتی.

٣٠٦٣. هەرگیز مەبە بە عەنتەری پیاوێ، تۆ هەڵپەڕی بەو بلێین پیاوێ.

٣٠٦٤. هەرکە جووزەلە لێبا شوان نییە.

٣٠٦٥. هەرکە رەفێق قەلەندەر[1] وێت، لە ریش و سمێڵ بێوەری وێت.

٣٠٦٦. هەرکە زۆر گەڕا زۆر ئەبینێ.

٣٠٦٧. هەرکە سپێی نەوێت بێ ئیمانە.

٣٠٦٨. هەرکە وەقەرز بوێتە زاوا، کەنین ئەیژێ ماڵ ئاوا.

٣٠٦٩. هەرکەس بار قورس بنێت وەکۆڵی، هەم دەسی دەشکێ هەم باڵ و قۆڵی.

٣٠٧٠. هەرکەس بان ماڵی زۆر بێت، بەفری زۆر دەبێ.

٣٠٧١. هەرکەس بە پێی عەقڵی خۆی قسەی لەگەڵ ئەکرێ.

٣٠٧٢. هەرکەس بەرز بفڕێ نزم ئەنیشێ.

٣٠٧٣. هەرکەس تۆریا بەشی خوریا.

٣٠٧٤. هەرکەس تاریف خۆی باتەوە، ئەیشێ ئەوەڵ زەکات گەوجی خۆی دەرکا.

٣٠٧٥. هەرکەس دەچێتە نێو قەبری خۆی.

٣٠٧٦. هەرکەس دوژمن لە بەر دەستیا نەکوژێ، دوژمن خۆیەتی.

٣٠٧٧. هەرکەس سمێڵی بوو پی ئەیژن پیاو.

---

١ـ قەلەندەر کەسێك بووە کە زۆر بایەخ و بەهای بەم دنیایە نەداوە و زۆر چاوی لە زەرەر و خەسارەوە نەبووە. وتوویانە ئەگەر دۆستی وەها کەسانێك بکەی لە ریش و سمێل بێوەری دەویت و تووشی خەسار دەبیت. یەکێك لە ئادابی قەلەندەری ئەوە بووە کە ردێن و سمێلی خۆیان دەتاشی و مەبەستیش ئەوەیە کە لەگەڵ هەرکەس هەڵسی و دانیشیت، خوو و خدەی ئەو کەسە دەگریت.

٣٠٧٨. هەرکەس گەورەیی ماڵ بدا بە دەس منالەوە لە عاقیبەت پیریا بڕوانە حالی.

٣٠٧٩. هەرکەس فرە خوات فرە ناژێ.

٣٠٨٠. هەرکەس قسەی زۆر کا، گوێچکە بۆ کەس ناگرێ.

٣٠٨١. هەرکەس لە ماڵ خۆیا پاوشایە.

٣٠٨٢. هەرکەس لە ماڵی خۆی سەری شا ئەبڕێ.

٣٠٨٣. هەرکەس نەیخوا، نەیدڕێ، حەقدار ئەیخوا و بۆی ئەتڕێ.

٣٠٨٤. هەرکەس وە تەمای خالۆ و مەمۆ وێت، ئێوارە بێ نان شەویش بێ دۆ بێ.

٣٠٨٥. هەرکەسێ سیر نەخوات بۆی سیر لە دەمی نایەت.

٣٠٨٦. هەرکەسێك نیشمانپەوەربێت یان دەبێ بمرێ یان دەربەدەر بێت.

٣٠٨٧. هەزار دۆست کەمە و دوژمنێك زۆر.

٣٠٨٨. هەزار چەقۆ درووس ئەکا دەسکی لـێ ناخا.

٣٠٨٩. هەزار فیکەت بە فیکەیەکم.

٣٠٩٠. هەزار «قل هو الله» مشتێ بەز ناهێنێ.

٣٠٩١. هەچی بەرەوژووریە بەرەو خوارییێکی هەس.

٣٠٩٢. هەچی کەسە خاسە بەڵام نە بۆ هەچی کارە.

٣٠٩٣. هەل رەش نان جۆیین.

٣٠٩٤. هەل هەموو کاتێك بە قازانجی زانا کار دەکات.

٣٠٩٥. هەلۆ وتی سوورەواڵە خالۆم بوایێت، گاو گاوەسەنگم ئەبردە ئاسمان.

٣٠٩٦. هەڵاتن عەیبە بۆ پیاوی شەڕکەر، بەڵام هەندێجار پێی ئەڵێن هونەر.

٣٠٩٧. هەڵەخەرج ئیمڕۆ، سوالکەری شەوەکی.

٣٠٩٨. هەڵەسۆی لـێ هاوردەتەوە.

٣٠٩٩. هەڵۆیسە لێرا مەویسە.

٣١٠٠. هەڵهەل ئەکەم چاو دوژمن کوێر بێت.

٣١٠١. هەمزە لە هەواسی چی، تڕ لە تەور و داسی چی.

٣١٠٢. هەموو کەس لە شەواڵ خۆیا پیاوە.

٣١٠٣. هەمیشە ژنەکەت کەنیشك وێت.

٣١٠٤. هەمیشە کەس بگرە کەس، ناکەس مەگرە کەس.

٣١٠٥. هەمیشە ئەونە لە خۆی قوشقییە.

٣١٠٦. هەنار هەتا نەیشکێنی نازانی ناوەکەی چۆنە.

٣١٠٧. هەنگەژاڵە گۆشتم تاڵە، چزەیێك بە لەو منالە.

٣١٠٨. هەنگوینە و ها لە پێس سەگا.

٣١٠٩. هەواڵ دێی دەور و پشت لە کوڕ یان کەنیشك عازەو بپرسن.

٣١١٠. هەوای بەری دایە لە سەری.

٣١١١. هەور رەش، هەورە تریشقە، هەور چەرموو بارانی هەس.

٣١١٢. هەورە بچکۆلە بەفری لێ ئەباری.

٣١١٣. هەورە گەورە دەمی چەورە.

٣١١٤. هەویر بپەڕێ میوانمان دێ.

٣١١٥. هەویر تا هەویرتورشی نەوێت نابێت بە نان.

٣١١٦. هەویر فەتیرە کەس نازانێ چەن گونکی تیا ئەوێت.

٣١١٧. هەی بژی وە مشتێ بیکوژی.

٣١١٨. هەی هەی، داوای کوز بێ تووك ئەکا.

٣١١٩. هەیاس وتیە: سێ کوا خۆڵم هەڵداوەتەوە، ئەوەڵ وەسەر ئەو کەسەی راز خۆی وە لای ژنەوە

ئەیژێ، دووەم بەسەر ئەو کەسەی بێگانە ئەکا وە قەوم، سێهەم وەسەر ئەو کەسەی بەقای بە ئاغای دونیایی بەستە.

٣١٢٠. هەیتە بۆ کەیتە.

٣١٢١. هڕ و بڕ لە یەك ناکاتەوە.

٣١٢٢. هێسر نازانێ بسەڕێنێ، لەقە ئەخات.

٣١٢٣. هێشتا جەژن نەووە برنج کریا ئاو.

٣١٢٤. هێشتا دزی نەگرتە بووەتە پاوشا.

٣١٢٥. هێشتا گوری گووی نەکردووە.

٣١٢٦. هێشتا نەیخواردە ئەفیڕێنێ.

٣١٢٧. هیچ شتێك گەوهەرناس نییە تەنیا مار نەوێت.

٣١٢٨. هیچ گەنجێك باشتر لە عیلم نییە.

٣١٢٩. هیچ عاقڵێ بۆ دار بێبەر بەرد ناخا.

٣١٣٠. هیچ کە لە سك دایکیەوە نەیهاوردە.

٣١٣١. هیچ کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ.

٣١٣٢. هیچ کەس لە باوکم ماقووڵتر نییە بێجگە لە قاتر.

٣١٣٣. هیچ کەس لە کردەی خۆی ناهمێ ناوێ.

٣١٣٤. هێلکە رایەك ئەشکێ.

٣١٣٥. هێلکە لە قەل نادزرێت.

٣١٣٦. هێلکەوڕۆن بۆ کەر لێ نێی گوێچکەی تێ ئەنێ.

٣١٣٧. هێن دەوڵەمەنەکان پارچەیێ لە بانی، وەلێ هێن فەقیرەکان دنیا پی زانی.

٣١٣٨. هیوا دارایی پیاوی فەقیرە.

٣١٣٩. هێواش رۆیشتن نابێتە هۆی نەگەیشتن بە مەقسەد.

٣١٤٠. هێوەرژن گوویان لەسەر سەریوان شەڕ ئەکا.

٣١٤١. یا پولّ لە گیرفانتا وێت یا زوان خوش لە دەمتا وێ.

٣١٤٢. یا خالّۆ پیشە یا باوك پیشە.

٣١٤٣. یا خوا عەرامەنە ویت.

٣١٤٤. یا زانا بە یا پرسا بە.

٣١٤٥. یا زەنگی زەنگی یا رۆمی رۆمی.

٣١٤٦. یا شام یا شیرازە، کەرەمتووی تیژ مایەی میرازە.

٣١٤٧. یا مەرد بە یا لە پەنای مەردا بە.

٣١٤٨. یا بێ بەر پرد یا بێ بوارە.

٣١٤٩. یاخوا ئەم دەس موحتاج ئەو دەسە نەوێت.

٣١٥٠. یاخوا باوەژن نەوێنی خۆشی، دارکاریمان ئەکا وە کلکەتەشی.

٣١٥١. یاخوا بزن بەرایی ران نەگرێتەوە.

٣١٥٢. یاخوا بیگەیێنی میوانی ئازیز بە رۆژگار بەهار یا شەوار پاییز.

٣١٥٣. یاخوا گای پیر کلك نەنێتە بان شانیەوە.

٣١٥٤. یاخوا گەدا دەوڵەمەند نەوێت.

٣١٥٥. یاخوا قایمقام بێتە خوڕخوڕە، بپرسێ دیوان ئەم کچ و کوڕە.

٣١٥٦. یارۆ وەسە گای مارۆ.

٣١٥٧. یاسین بە گوێی کەرا خوێندن هیچ نییە، غەیری خۆ ماندووکردن نەبێت.

٣١٥٨. یەزد دوورە، گەز نزیکە.

٣١٥٩. یەك پەی یەك رۆژە، دوو پەیی دوو رۆژە.

٣١٦٠. یەك جۆش شانس، باشترە لە خەرواریٚ عیلم.

٣١٦١. یەك دەست دەنگی نایێ.

٣١٦٢. یەك دەسی پڕ لە پارە بەهێزترە لە دوو دەسی پڕ لە حەقیٚقەت.

٣١٦٣. یەك ساڵەیەك دوو ساڵەیەکی خەڵەتان.

٣١٦٤. یەك هەنگاوی رۆژ، دوو هەنگاوی شەو دیٚنیٚ.

٣١٦٥. یەکیٚ نای، یەکیٚ رنیەوە.

٣١٦٦. یەکجار خەتا ئینسانی، ئەمما تیکرار حەیوانی.

١. ئۆخەی ئۆخەی لپ و لچ، خوا کارێکی کرد نەتیکردە کچ. (کوڕ)

٢. ئەچێتە دەرەوە پڕە، تێتە ماڵەوە خاڵییە (کەوش)

٣. ئەیکەی یا ئەییەی. (نوێژ و بانگ)

٤. ئەم لای گڵە، ئەولای گڵە، ناوەڕاسەکەی فێنکی دڵە.

٥. ئەمە چییە چی بە چییە، کاوراییێکی قاچاخ چییە. (مشك)

٦. ئەمە چییە، ئەستەغفیرەڵڵا، خوایش ئەنێتە ژێر. (قەڵەم)

٧. ئەو چتە چییە، بێ قاچ و باڵە، هەر سەعات بڕێ گۆشتی حەڵاڵە. (ماسی)

٨. ئەوە چییە هەر روو ئەکا لە خوا. (کولانجە)

٩. ئەوەڵ گردە، دووهەم پانە، ئەرێ کەر نیت بێژە نانە. (نان)

١٠. ئەیکەیتە خۆتا حەزی پێ ئەکەی. (کەوچك)

١١. ئەینم پێتەوە لێت ناوێتەوە. (ناو)

١٢. بێگیانە و گیاندارە. (مار)

١٣. باتە ناو ئاوا تەڕ ناوێت، باتە ناو رۆنا چەور ناوێت. (سێوەر)

١٤. باڵی هەیە نافڕێ، قنی هەیە ناتڕێ، دەمی هەیە ناقڕێ. (ماسی)

١٥. بانی گۆشتە و ژێری موو. (لووت)

١٦. بانێکە و بنبانێکە، چوار مەڕ و شوانێکە. (دەس)

١٧. باوك سێ ساڵان کوڕی وە شار ئەچێ. (هەنگوور)

١٨. بە سێ براوە ریخۆڵەییێکیان هەس. (تەزوێح)

١٩. بەری بەرخە، پشتی کارە، دەمی قەیچی، کلکی مارە. (قشقەڕە)

٢٠. بەری لە بەحرانە، پشتی لە کێوانە، خواردنی خەل و خەرمانە.

٢١. بەچکەکەی شیر ئەدات وە دایکی. (کوورە)

٢٢. برایەکم هالە عەرەوشە، بار کەرەکەی درەوشە. (ژژی)

٢٣. بونگسێ لە کاورا، جفتێ لە ژن. (نوێژ)

٢٤. تاڵێ هەورێشم، هەتا بەغا ئەکێشم (رێگا)

٢٥. تانجیه زەردەی عەڵقە لە گوێ، دەوران ئەکا لە دەوری دێ. (تەرازوو)

٢٦. تەپێك و بانێ، چوار بزن و شوانێ. (دەس)

٢٧. تەقیلە لە بان تەقیلە، هەرکەس نەزانێ زەلیلە.

٢٨. تەواو دنیا بێرا ملیا هیچی لێ نایێت وەلێ بیخەیتە ناو ئاو ئەشکێ. (کاغەز)

٢٩. پانێ لە بان پانێ، قنجێ لەناو کوناکەی، دەسێ ئەگەرێ وەلاکەی، خولی ئەدا بۆ کاکەی. (هارە)

٣٠. پەنج فریشتەی یەك رەنگ، شاخە لەبان سەر، دوو شاخەی سروەی دەم پڕ لە گەوهەر، حەزمە لە بان سەر، سەحرای سفید رەنگ (دەس ـ خودکار ـ دەفتەر)

٣١. پێنج فەرزە و «بسم الله»ی تیا نییە. (بانگ)

٣٢. جفتێ ئەسحابەی حەق ئافریدە، هەم زەحمەتکێش و هەم سەحرا چەریدە. (گای جووت)

٣٣. حەزرەت پەنجەکێشی کوڕ چ پێغەمبەرێك بوو. (تەنوور)

٣٤. حەواڵکە، حەوا ئەکا، وە دەس و پا سەما ئەکا، کولێرە بۆ کوڕ پاوشا ئەکا. (هەنگ)

٣٥. حەوزێکم هەس مارێکی هاتیا، حەوزەکە لە مارەکە ئەخوا، مارەکە لە حەوزەکە ئەخوا. (لامپا)

٣٦. خۆر لە خۆرئاوا، ئاو لە ئەفتاوا، هەرکەس بیزانێ عەقڵی تەواوە. (نوێژ)

٣٧. خۆمان هەمانە، وەلێ خوا نیەسی. (خوا)

٣٨. خانم پەڕۆ قن. (کەنوو)

٣٩. خڕە و رەقە وەك کەلا، چوار منداڵ لە زکیدایە. (گوێز)

٤٠. دۆخەوای بەهار پوونگە وەسەرە، لە شووی نەکردوو کۆرپە وە بەرە.

٤١. دار تاشیاو، نەجار نەدیدە، ئارد هاڕیاو ئاسیاو نەدیدە، کەوای دوریاو، خەیات نەدیدە. (سرینچك)

٤٢. دار لە بان دار، ئاسن جلەودار. (تەشی)

٤٣. دارێکم هەیە، دار هەنارە، هەر لیپێکی سەد هەزارە. (تیشکی خۆر)

٤٤. دارێکم هەیە، داری یاقووە، هەر پەلێکی چل چەقۆە. (خۆر)

٤٥. دایك پۆلایی، باوایی سەنگ خار، رۆڵە ئەخاتەوە وەك دانەی هەنار. (قاوچەخماخە)

٤٦. دەس ئەخاتە کەلەکەی میز ئەکا. (سەماوەر)

٤٧. دەس ئەکەیتە چاویا، دەم باز ئەکا. (قەیچی)

٤٨. دەم تەقێنەی سەر لەقێنە. (گورگ)

٤٩. دەمت ها لە قنیا و چاوی لـێ زاقەو ئەکەی. (سیغار)

٥٠. دەمەکەی ئاهەن، دەسکەکەی دارە، کەرە مشارە، کەرە مشارە. (مشار)

٥١. دەمەکەی باریك، قنەکەی کونە. (دەرزی)

٥٢. دەمی شاخە، سەری چەرمە، دەنگی زلە، تووکی نەرمە. (کەڵەشێر)

٥٣. دەنگی هەیە، رەنگی نییە، مقاش گیرە و گۆشتی نییە. (تڕ)

٥٤. دەورەکەی پەرچین، ناوەکەی نەخشین. (چاو)

٥٥. دەورەکەی گردە، ناوەکەی چاڵە. (کڵاو)

٥٦. دنیا هاوە نووکیەوە. (قەڵەم)

٥٧. دنیای پیا ئەچێ، نۆکێکی پیا ناچێ. (گوێچکە)

٥٨. دوانزە تماشاگەر و سێ بازیکون. (سەعات)

٥٩. دوو گەوڕ و کۆڵەکەیێ. (لووت)

٦٠. دوو ئاو بە جۆلەیەکا ئەڕوا ئاوێتە ناوێ. (هێلکە)

٦١. دوو پا و دوو سم، هەڵێنەیری ئەتکوژم.

٦٢. دوو چتە لە قنەو تێت، وەلـێ ئەخورێ. (هەنگوین و هێلکە)

٦٣. رۆڵەی بێ دایە، تاجری بێ مایە، درەخت بێ دایە. (عیسا، دونیا، حەزرەت موحەممەد)

٦٤. راستە وەك چنار، چفتە وەك هەرجن، ئامۆزای شەیتان برای دێو و جن. (مار)

٦٥. رەشە وەك بزن، گونك ئەگرێ وەك ژن. (قۆلانچە)

٦٦. رەشە وەك قیر، دەر ئەچێ وەك تیر. (کێچ)

٦٧. رەشە وەك قیر، چەرموو وەك شیر، ئەفڕێ وەك تیر. (چاو)

٦٨. رەشە وەك قیر، قووڵە وەك بیر. (چەکمە)

٦٩. زەردە وەك تەڵا، حاکمە وەك مەلا. (پڕتەقاڵ)

٧٠. زەردە، دەردە، لە بن بەردە. (دووپشك)

٧١. زگی پڕە و لێوی نییە.

٧٢. زنێوی بێ گوڵ، باخی بێ دڵ. (هەنجیر)

٧٣. زواندار و بێزوان ئەڕۆن بۆ دیوان، زواندار ئەوێسێ وەك بێزەوان، بێزوان تێتە زوان. (نامە)

٧٤. سێ بەی، سێ زەردەبەی، سێ هەنار، سێ ژەهری مار. (فەسڵ)

٧٥. سێ برا کڵاوێکیان هەیە. (پاچکە کوانوو)

٧٦. سێ بران و بە دەور دنیاوە ئەچەرخن. (سەعات)

٧٧. سێ پا لە زەمین، چوار پا لە هەوا، ناڵە ناڵیەتی لە درگای خوا. (مەشکە)

٧٨. ساف و لووسە، چل و چوار گوێچکەی هەیە. (موجحمە یا کەشەفی)

٧٩. سەد مەرم هەیە و یەك ریخۆڵە. (تەزوێح)

٨٠. سەر سەوز و بن کوڵ. (تاڵ)

٨١. سەرم مسە، پام مسافرە، دڵم موسڵمانە، نەفسم کافرە. (بنیام)

٨٢. سەری ئەبڕی، جنجنی ئەکەیتەوە دوایش بۆی ئەگیری. (پیواز)

٨٣. سەندووقی سلێمان پڕە لە سوور و جوان. (هەنار)

٨٤. سکی پڕە، سێوەری نییە. (چاڵ گەنم)

٨٥. سنووق سلێمان پڕیە لە پیر و جوان. (قەورسان)

٨٦. سنووق سنووق سەمەنی، تەقە بکەی نەکەنی.

٨٧. سنووقێ هەمرۆ گوڵاوی، شەو خەفتم سۆح هەڵسام نەماوی.

٨٨. سوارێکمان بۆ هات، ماینەکەی دارە، گیای بن دارە، کانیەکەی گۆشتە، ئاوەکەی شەکەرە. (مەمك دایك)

٨٩. سی سوار هاتن بۆ ئەم دێیە، هەرکەس لە خەڵکی دێ سی سواری ئەکەوێ. (ڕۆژوو)

٩٠. سیانی ها لە نسارا دوانی ها لە خۆرەتاوا. (نوێژ)

٩١. شەش کەنیشکن، دوو کچمە، دوو بووکمە، دوو دایکمە، گشتیشیان ژنمە.

٩٢. شەشەی شەش کون، شەش تۆن باریەسی، خۆی بێگیانە و گیاندار سواریەسی.

٩٣. شەقە شێوە، چەچۆڵە، باڵتای ڕەشی لە کۆڵە، ئاوی لێتێ چ سۆڵە.

٩٤. شێخی بێ شین زۆر خۆشە گەر لە هاوینا دەسکەوێ، عەکسی ئەو عەکسی دەران قەد لە

زستان نامەوێ. (یەخ)

٩٥.   چارەکەکەی چوار گۆشە، پڕە لە وردە پێشە. (ئاسمان)

٩٦.   چاڵە قووڵە دەوری تووڵە. (چاو)

٩٧.   چاڵێکم کەند، چل گەزی، فاتمەخانمی تیا هەڵبەزی، پڕ سەری بوو لە دەرزی. (کەنگەر)

٩٨.   چەفتی چەقالە، چەفتی دار هەنجیر، ئامۆزای شەیتان، برازای دێو هەنجیر. (قۆچەقانی)

٩٩.   چتێکم هەس دریای نییە. (هێلکە)

١٠٠.   چتێکم هەس چتانی، ها لە باخەڵ سوڵتانی. (نان)

١٠١.   چتێکم هەس چی چییە، هەر لە بوخچەی مەنیجیە، ئەزانم هەس و نازانم چییە. (ژن ئاوس)

١٠٢.   چل تاق، چل نیم تاق، چل خەجیجەی چاو زاق چاوزاق. (هەنار)

١٠٣.   چل دەرپ و چل دەرپێزە، چل غولام چل خەجیجە.

١٠٤.   چنێکم هەس وە هۆهۆ، نە تاڵی هەس نە پۆ. (جاڵجاڵووکە)

١٠٥.   چوار تووڵم نا لە دەرەوەزان، دووانم گرت و دووانم لەرزان. (گوان مانگا)

١٠٦.   چواری ئەچەقێ، هەشتی ئەلەقێ. (دەڵ)

١٠٧.   چواری چاوە، هەشتی هەناوە، مەوەڕی ناوە. (گای جووت)

١٠٨.   چواری چاوە، هەشتی هەنگاوە، پێمەڕەی ناوە. (گاوەسەنگ)

١٠٩.   چییەچییە هەشت چاوی هەیە، بەڵام جوان نابینێ. (جاڵجاڵووکە)

١١٠.   گۆشتی لە دەر، پێسی لە ناو، سەنگی مەڕمەڕ ئەکاتە ئاو. (کولەزری)

١١١.   گا سوورە، گاڕەشی بردە بان. (ئاور)

١١٢.   گاگولەی، پەت لە ملە. (سەوەتە)

١١٣.   گاسوور، گاڕەش ئەڕفێنێ. (ئاور)

١١٤.   گەرمیشە و نەرمیشە، بەنەخوێنەکەو کەرەوە تی نیشە. (شیاکەی مەڕ و ماڵات)

١١٥.   گەوڕێکم هەس سەد سەر مەڕی پیا ئەچێ، وەلێ باقە گیایەکی پیا ناچێ. (شارە مێرووله)

١١٦.   گڕ و گاڵە پڕ ناو ماڵە. (گلۆپ)

١١٧.   گشتی لەسەرەوە ریش چەرموو ئەکا، وەلێ ئەو لە قنەوە. (پیاز)

١١٨.   گوری هار کەوتە ناو دار. (تەور)

١١٩. گیاندار هاوە بان بێ گیانەوە، بێ گیان ها وە بان بێ ئیمانەوە.

١٢٠. عاسمان تۆران تۆران، لێی ئەوارێ بەفر و بۆران. (هێڵەك)

١٢١. فەرز پەنجە و رۆژ شەش. (جومعە)

١٢٢. فەرزە بیچەقێنی، سونەتە بیلەقێنی. (کلکەوانە)

١٢٣. قاسم دیوار سم. (مشك)

١٢٤. قاچ و قولی باریکە، بن باڵی بۆرە. (پەپوولە)

١٢٥. قافڵەی سەنگین، مرخ بێزوان، هەرکە هەڵیبیێرێ عەجەو پاڵەوان. (مێروولە)

١٢٦. قوتکە قوتکەی دەور ئاوایی، قوتکە قوتکەی ناو ئاوایی. (کۆشك)

١٢٧. قورسە وەك پۆڵا، شیرین وەك هەنگوین. (خەو)

١٢٨. کاسە کەلێ ها وەو لێژەوە. (گوێچکە)

١٢٩. کاسەیەك رەنگ و دوو ئاو. (هێلکە)

١٣٠. کام گیاندارە لە منالێدا چوار پای هەیە، لە جوانیدا دوو پای هەیە و لە پیریدا سێ پای هەیە. (ئینسان)

١٣١. کانییە گەنێ لە بنە بەنێ، شا و شازادە دەسی تێ ئەنێ. (لووت)

١٣٢. کانییە گەنی لە بەر بەنی، شاو شازادە دەمی لێ ئەنێ. (مەمك)

١٣٣. کاورێکم هەس بەرخێ ها لە سکیا، بەرخەکەیش بەرخێ ها لە سکیا. (شێلانە)

١٣٤. کەرەشین، کەرەون شین، بەستمەوە لە میرەوەی شین. (شوتی)

١٣٥. کەڵەمەشانی، سەرنووك دەرزی، هەرکە هەڵی بێرێ سەدتمەن ئەرزی.

١٣٦. کەماخۆرە کەر نییە، هێلکەکەرە مەل نییە. (کیسەڵ)

١٣٧. کەڵانەی کەوو نرخ بێ زووان، هەرکەس هەڵی هاورد عەجەو پاڵەوان. (خاڵ)

١٣٨. کڵاو هەمزە پاڵەوان نە تەقەڵ ئەخوا نە دروومان. (هێلکە)

١٣٩. کڵە مووی نییە، شڵە دۆی نییە. (قورباق)

١٤٠. کوتەناڵێ خستمە چاڵێ وایەی ساڵێ.

١٤١. کوڕ کوڕەکەم، برای مێردەکەم.

١٤٢. گا نییە و وەك گا کاوێژ ئەکا، دەم چەفتی خاوەنی ئەکا.

١٤٣. گشتی ئەخەفێ، قیتە ناخەفێ.

١٤٤. لە بانەو زەوقە لە خوارەو تەوقە. (قارچك)

١٤٥. لە بەرد قورسترە، ئەکەوێتە سەر ئاو.

١٤٦. لە سك دایکی دێتە دەر، پشت دایکی ئەخورێنێ. (شەمچە)

١٤٧. لە سووزنێك دەرئەچێ لە دەروازەیەك دەرناچێ.

١٤٨. لە کێفا سەوزە، لە بازاڕ رەشە، لە ماڵا سوورە. (چایی)

١٤٩. مامرە زەردە لە کونا مردە. (رۆن)

١٥٠. مامرە قوڵەی مەریوان، خۆشخۆش ئەچێ بۆ دیوان. (پووڵ)

١٥١. مامرە کوڵەی جەوهەری، هەزارهەزار لە دەوری. (مانگ)

١٥٢. ماین لە ماڵەوە کام و زامییە، کوڕیلە لە بانەوە رەپڕەپانییە. (تەنوور و دووکەڵ)

١٥٣. ماینە چەرمووی کەریم خان، کەف ئەڕژێنێ شانەوشان. (ئاسیاو)

١٥٤. مایین رەشی بەحری نە تووکی هەیە نە خوری. (قۆلانجە)

١٥٥. مەلێ بۆرە، چاوی کوێرە. (شەمشەمە کوێرە)

١٥٦. مەلێك هات وە سیسی، نیشتە بان قورسی، عیسا لە مووسایی پرسی، وتی ئەمە چییە وە سك برسی. (مردوو یان تەرم)

١٥٧. مەلێکم هەس مەلە مەستۆرە، قاچ و قول باریك بن باڵە بۆرە. (کوللە)

١٥٨. مەلێکم هەس مەلە ساتۆرە، دوو چاوی لەبان چاوێك گلۆرە. (پەپوولە)

١٥٩. مزگەوتەکەی گۆشتە، مێحراوەکەی ئاوە، هەرکە هەڵی بێرێت عەقڵی تەواوە. (ماسی)

١٦٠. مل باریکە، شەو تاریکە، خۆم ناوێرم، تۆ ئەنێرم. (تفەنگ)

١٦١. منالێکە هەر بوو لە دایك قژی چەرموو کرد. (گەنمە شانی)

١٦٢. ناوی سوورە هەلامە، دەوری رەشە هەلامە، بە نەرمی تیخە، وە رەقی دەری بێنا، سونی الله محمد. (نان)

١٦٣. نە دەسی هەس نە پا، پیاو ئەرفێنێ وەك گا. (گوو)

١٦٤. نە دەسی هەس نە پا، ئەچێتە پای دیوان قسەی رەواج. (پووڵ)

١٦٥. نەدارە نە دیوارە، پێچ پێچەکەی سەد هەزارە. (قەمچ و قولاو)

١٩١. هەر ئەڕۆیت و بە شوێنتا دێت. (سێوەر)

١٩٢. هەر ئەیکێشن کەم ئەوێت. (سیگار)

١٩٣. هەر لە ئاسمان تا زەوی گوێرەکە سوورەی دەم و لچ قەوی. (ڕۆچن)

١٩٤. هەر لێرە تا بانە گشتی سۆفیە سەر پانە.

١٩٥. هەر لێرەوە تا مەککە گشتی شەك و چاو بەڵەکە. (کچ)

١٩٦. هەڕاکەرە هەڕا ئەکا، وە چوار پەلە سەما ئەکا، خۆراك شایش پەیا ئەکا. (هەنگ)

١٩٧. هەڵتم و مەڵتم شەش پا و دوو سم، هەڵی نەتێری وە ملتا ئەتسم.

١٩٨. هەڵ ئەچێ و دا ئەچێ وە قنا ئەچێ. (پاتۆڵ)

١٩٩. هەڵ تەقێنەی، مەڵ تەقێنە، کاوڕە لەڕەی دەم تەقێنە. (هێلکە)

٢٠٠. هەڵی ئەخەی مەاس، دای ئەخەی حاجییە. (هێلکە)

٢٠١. هەی یاران، هەی یاران، خۆی داپۆشی بە چارەکە، نە مریشکە نە باڕۆکە. (کەلەرم)

٢٠٢. هێن خۆتە و خەڵك فرەتر لی ئیستیفادە ئەکا. (ناو)

١٦٦. نەدەمی هەیە نە دیان، فیکە ئەکا وەك شوان. (قنگ)

١٦٧. نەرمیشە، گەرمیشە، چەوریشە، بەنەخوێنەکەی هەڵکێشە، بینە ئەو دەم و ریشە. (گیپە)

١٦٨. نەزانییە، نەماییە، مرقەمرقی خۆڕاییە.

١٦٩. نەچیر دەرچوو، سەوی پێوە بوو. (حەزرەت موسا)

١٧٠. نە گەوەی هەس نە گیپاڵ، چنگ ئەگرێ لە قەو دیوار. (دریا)

١٧١. نیمە پڕە، پڕە نیمەس. (مانگ)

١٧٢. نێوی هەیە، ناوکی نییە.

١٧٣. وە حەوت برا کڵاوێکان هەس. (قورسی)

١٧٤. وە دە نەفەرەوە پاتۆڵەکەیان داکەند. (دەس)

١٧٥. وە رۆژا ئاوس وە شەوا قسر. (کەوش)

١٧٦. وە شەوا خانم وە رۆژا حەماڵ. (گسك)

١٧٧. وە نەرمی تی ئەخەی وە رەقی تێریتە دەرەوە. (نان)

١٧٨. وە تف سافی کە، وە دەس رەقی کە، بیکە کونەکەیا. (دەرزی)

١٧٩. وەختێ ئەخەوی چی ئەنێیتە ژێر سەرت. (شایەتیمان)

١٨٠. وەختێ سەری بوڕی ئەگیری. (پیاز)

١٨١. وەساکەی دەورحەوش، گەرەکمە جفتێ کەوش، بە دەرزی، بێ درۆش. (وەزەنگی ئەسپ)

١٨٢. وە شەو ئەڕۆی قۆینە، وە رۆژ ئەڕۆی قۆینە، مانی نەوی قۆینە. (ئاو)

١٨٣. وە قسری گوان ئەکا. (کەنیشك)

١٨٤. وە دە ئەڕۆی بۆی، وە دوو ئەیگری. (سپێ)

١٨٥. وەسا وەسایە، وەسایی زەرووره، چواردەوری بەحرە ناوی تەنووره. (سەماوەر)

١٨٦. هۆڵ زەڕ رووی لە خوا. (رۆچن)

١٨٧. هەتەڵ مەتەڵ، سەرنووکەکەی نەقیزە. (برنج)

١٨٨. هەر ئەڕۆا هەر خۆڵ ئەداتە سەر خۆیا. (گاوەسنگ)

١٨٩. هەر ئەڕۆی پووك لە زەوی ئەنێ. (مامر)

١٩٠. هەر ئەڕۆی هەر پی ناگەی. (سێوەر)